# بنەماکانی زانستی ئامار






د. تەها حوسێن عەلی
د. سەردار عوسمان باداوەیی

چاپی دووەم 2015

# بنەماكانی زانستی ئامار

د. تەها حوسێن عەلی        د. سەردار عوسمان خدر باداوەیی

چاپی سێیەم 2015

## ناسنامەی كتێب

ناوی كتێب :– بنەماكانی زانستی ئامار

نووسەر :– د. تەها حوسێن عەلی، د. سەردار عوسمان خدر باداوەیی

پێداچوونەوەی زمانەوانی: د. نەریمان خۆشناو

پیتچنین: بیشار سەردار

نەخشەسازی بەرگ:

تیراژ:(1000) دانە.

نۆبەتی چاپ :– چاپی سێیەم 2015

شوێنی چاپ :– چاپخانەی هیڤی – هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی كتێبخانە گشتییەكان

ژمارەی سپاردنی ( 2441 ) ی ساڵی 2011 ی پێدراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

**ذَلِكَ الَّذِي يُبَشِّرُ اللَّهُ عِبَادَهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُ فِيهَا حُسْنًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ**

**سورة الشورى**

**الاية (23)**

# پێشکەشە بە :

*گیانی پاکی سەروەری مرۆڤایەتی پێغەمبەرمان ( محمد ) ( دروودی خوای لە سەر بێت ).

*بە هەموو ئەو کەسانەی شەونخوونی دەکەن لە پێناو بە دەستهێنانی زانست و زانیاری بۆ خزمەت کردنی وولاتەکەیان.

*بە مامۆستای قۆناغە جیاجیاکانی خوێندنمان.

***نووسەران***

# پێشەکی

سوپاس بۆخودای گەورەو دوردی خواش لەسەر پێغەمبەری مەزنمان .ئاشکرایە بنەماکانی ئابووری بەیەکێك لەبابەتە گرنگەکان دادەنرێت ، کەبەدەروازەی بنەرەتی زانستی ئامار ولقە پێشکەوتووەکانی دادەنرێت، لەهەمان کاتدا ئامرازێکە بەکارهێنراوە لەزۆربەی زانستە جۆراوجۆرەکان لەبواری پراکتیکی دا بەکاردەهێنرێت. لەسەر ئەو بنچینەیەدا ئەم کتێبەی بەردەستی بەرێزتان شێوازی ئاماریی سادەو لەهەمان کاتدا گرنگی لەخۆگرتووە ، کە بەوانەی بنەرەتی و پرۆگرامی خوێندنی ئاماریی دەستپێك دادەنرێت، پێش ئەوەی بچینە نێو شێوازی ئاماریی پێشکەوتوو ، کە لە قۆناغە پێشکەوتووەکانی بەشی ئامار دەخوێندرێت، سەرباری ئەوەی لە لقە جیاجیاکانی بەشی کارگێڕی و ئابووری و ژمێریاری و زانستە دارایی و بەنکییەکان دەخوێندرێت، کەهەوڵ دراوە پشت بەلایەنی پراکتیکی ببەسترێت ، ئەویش لەمیانەی پێشکەش کردنی ژمارەیەك نموونەی ئابووری و کارگێڕی و لەهەمان کاتدا دوورکەوتنەوە لەلایەنی تیۆری و ماتماتیکی ، کە گرنگی ئەوتۆی بۆ بەشە زانستیەکانی تر نییە( بێجگە لەبەشی ئامار نەبێت) بۆقوتابی و توێژەران، کەڕەنگە ببێتە بارگرانی لەسەرقوتابی و گرنگی لەسەر لایەنی زانستی و پراکتیکی لاواز بکات، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ماوەی خوێندنی ئەو بەشانە بۆ وانەی ئامار . هەروەها دەتوانرێت ئەو شێوازە ئامارییانە وەك پرۆگرامی خوێندن یان شێوازی ڕوون کردنەوە بۆتوێژەران لەبواری زانستەکانی دیکە بەکاردەهێنرێت، وەك زانستی پزیشکی، ئەندازەیی ، ماتماتیکی ، کۆمەڵناسی ، فەلسەفە، کیمیا، جوگرافیا،...هتد.ئەم کتێبە زمانی ئامارێکی ئاسانی بەکارهێناوە، کەتایبەتە بەوقوتابیانەی کەزانستی ئامار دەخوێنن ، هەرلەم کتێبەدا پاشکۆیەك ئامادەکراوە، کەگرنگترین زاراوە زانستییە بەکارهێنراوەکانی تێدا پێشکەش کراوە، لەهەمان کاتدا کورتەی گرنگترین پێوەرە ئامارییە بەکارهێنراوەکانیشی لەخۆ گرتووە، سەرەڕای ئەمانەش ئەم کتێبە بەیەکەم کتێبی بنەماکانی زانستی ئاماردادەنرێت، کەبەزمانی

کوردی پێشکەش بەقوتابیانی بەڕێزی زانکۆو پەیمانگاکانی هەرێمی کوردستان کراوە.لەکۆتاییدا هیواخوازین ئەم کتێبە جێگای بایەخ و ڕازەمەندی قوتابیان و مامۆستایان بێت، لەگەڵ ئەوەی چاك دەزانین کەئەم کتێبە پێویستی بەتێبینی و پێشخستن هەیە لەلایەن مامۆستاو قوتابیانەوە بۆ ئەوەی لایەنی لاوازی کەم بکرێتەوە، چونکە ئێمە باش دەزانین کە کامڵ بوون تەنیا بۆخودای گەورەیە .

﴿ وأما الزبد فيذهب جفاء وأما ماينفع الناس فيمكث في الأرض ﴾

صدق الله العظيم


د.تەها حوسین عەلی
بەشی ئامار
کۆلیژی کارگێری و ئابووری
زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

د.سەردار عوسمان خدر
بەشی ئابووری
کۆلیژی کارگێری و ئابووری
زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

# ناوەڕۆک

## 1.1 : زانستی ئامار:

زانستی ئامار هەر لەکۆنەوە ناسراوە،بە ژماردن لەلایەن میژونووسی یۆنانی (هیرۆدۆتس) کراوە،ئەویش لەساڵی (480)ی پیش زایین، کاتێك یەکیك لەسەرکردەکانی سوپا رێگایەکی سەرەتایی و سادەی بۆ زانینی ژمارەی سوپاکەی پەیرەو کردووە.هەروەها لە قورئانی پیرۆز، لەزۆر شوێندا ئاماژە بەلایەنی ئامارەوە دراوە بەتایبەتی پرۆسەی ژماردن، هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێت(لقد احصاهم وعدهم عدا) بەهەمان شێوە لەژیاننامەی پێغەمبەرمان محمد(دروودی خوای لەسەر بێت) نموونەیەکی جوان لەبارەی پرۆسەی سەرژمێری یان ژماردن هەیە ئەویش ئەوکاتەی پێغەمبەرمان مەزندەیەکی وردی بۆژمارەی سوپای قورەیشیەکان لەجەنگی بەدردا کرد،ئەویش ئەوکاتەی زانی قورەیش رۆژانە(9)حوشتر لەدەست دەدات.

ووشەی ئامار (STATISTICS) داتاشراوە لە ووشەی لاتینی (STATUS) ،یان لەووشەیەکی ئیتالیەوە(STATISTA)،یاخود ووشەیەکی ئەڵمانییە (STATISTIK)هەر هەمووشیان مانای راستەقینە و زانیاری لەسەر دەوڵەت دەداتە دەستەوە(POLITICAL STATE) ئەمەو ئەو چەمکە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری تایبەت بەتاکەکانی کۆمەڵگا بەکاردەهێنرێت،بەمەبەستی پێکهێنانی بیرۆکەی هێزی کار،هەروها پێکهینانی بنکەی زانیاری ،کەلەمیانەیدا دەتوانرێت دەوڵەت باجی پێ بسەپێنێت، تا دۆخی دارایی خۆی بەهێز بکات.

کەواتە ئامار بریتییە لە(لێکۆڵینەوە لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگاو پێکهێنانی دەرەنجامەکان لەبارەی کۆمەڵێکی گەورە لە داتاکان ،ئەویش کاتیك بەشێکی بچووك لە داتاکان بەدەست دەهێنرێت).

هەروەها دەتوانرێت ئامار بەوە پێناسە بکرێت کە بریتییە (لەشێوازێك یان ئامرازێك،کە لەمیانەیدا دەتوانرێت راستیەکان و زانیارییەکان کۆبکرێتەوەو بەشێوەی ژمارەیی دابرێژرێت یان مەزندە بکرێت بەپێی ئاستێکی گونجاو لەوردەکاری،وکۆکردنەوەی راستی و زانیارییەکان بەشێوەی خولی رێکخراو بۆ مەبەستی دیاریکراوی پێشوو،بەهەمان شێوە رێکبخرێت کە پەیوەندی لەنێوانیان روون بکرێتەوە).

بەکورتی دەتوانرێت زانستی ئامار بەوە پێناسە بکرێت،کەبریتییە لە (زانستی مەزەندەو

ئەگەرەکان)هەروەها زانستی ئامار بەوە پێناسە دەکرێت،کەبریتییە (لەو زانستەی،کە گرنگی بەدابین کردنی ڕاستیە ژمارەییەکانی دیاردە جۆراوجۆرەکان دەدات،دوای ئەوە ڕێکیان دەخات و دەیانخاتە ڕوو،ئینجا شیان دەکاتەوە بەمەبەستی دەرەنجامی دیاری کراوی وورد،بەئامانجی تێگەیشتن لەدیاردەکان لەلایەك و لەلایەکی دیکە پێشکەش کردنی پێشنیاری جۆراو جۆر بۆ بەدواداچوونی ئاراستەی ئایندەی ئەو دیاردانە).ئامار لە زۆر بوار بەکاردەهێنرێت وەك زانستی بایۆلۆژی،وپزیشکی،وکشتوکاڵی، وئابووری،وکارگێڕی،وکۆمەڵناسی،ودەروونناسی،وڕەگەزناسی،وپیشەسازی،وکیمیاو،وەرز شی و......هتد.

## 2-1 :-قۆناغەکانی پرۆسەی ئامار:-قۆناغەکانی پرۆسەی ئامار لەمانەی خوارەوە پێك دێت:

1-)**<u>کۆکردنەوەی داتاکان:</u>**-بریتییە لەزانیاری سەرەتایی ژمارەیی کەدەتوانرێت بەدەست بهێنرێت، لە سەرچاوەکانی حکومەت یان کەرتی تایبەت یاخود لەڕێگای ئەنجامدانی ڕاپرسییەوە، یان دیاریکردنی بژاردەوە بەبێ ئەوەی پێویستی بە وەرگرتنی هەموو زانیارییەکان بکات.

2)**<u>ڕێکخستنی داتاکان:-</u>** ئەو داتایانەی کە بەدەست دەهێنرێت، لەڕێگای خشتەی ئاماری یان شێوەی هێڵکاری ڕێکدەخرێت، بە مەبەستی چارەسەری ماتماتیکی و ئاسانکاری سەیرکردن و زانینی هەندێك ئاماژەی سەرەتایی.

3)**<u>چارەسەری ما تماتیکی:</u>**-لەڕێگای چارەسەری داتاکان بە شێوەی ماتماتیکی،ئەویش بەمەبەستی دەرهێنانی دەرەنجامی ژمارەیی(ئاماژە ئامارییەکان)، وەك: پێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی، یان پرشوبڵاوی یاخود هاوکۆلکەکانی پێکەوەلکان.....هتد.

4)**<u>شیکردنەوەی دەرئە نجامەکان:</u>**-ئەوەش بە گرینگترین پرۆسەی ئامار دادەنرێت و بەبێ ئەم هەنگاوەش دەرئەنجامەکان ژمارەیی دەبن و مانای نابێت، بۆیە ڕاڤەکردن جۆرێك لە ئەمانەت و ڕاستگۆیی و نەبوونی تەحییز و شارەزایی تەواوی لەبابەتی توێژینەوە دەبێت، هەروەها زانستی ئامار سێ ئاراستەی هەیە،کە هەریەکەیان ئەویتر تەواو دەکات:-

1)**<u>ڕێگای ئاماریی:</u>**- (STATISTICAL METHOD) ئەو ڕێگایە بریتییە لە چۆنیەتی دیاریکردنی بژاردە(SAMPLE)، دوای ئەوە کۆکردنەوەی داتاکان و لێکۆڵینەوە لە داتا

ماتماتیکییەکان و گەیشتن بە دەرئەنجامی داتاکان، کەواتە بریتییە لە کۆمەڵێك شێواز و هاوکێشەی ماتماتیکی و یاسا و ڕێوشوێنەکان، کە یارمەتیمان دەدات بۆ توێژینەوە لە هەر بابەتێکی ئاماری و پراکتیزەکردنی لە بوارە جۆربەجۆرەکانەوە.

2)**تیۆری ئاماری:-**(STATISTICAL THEORY) بریتییە لەبناغەی زانستی،کەلەڕێگای ئاماری و تیۆرەکان پشتی پێ دەبەستن،کە ڕاڤەی هاوکێشەو یاساو شێوازەکان دەکات،لە ئامار بەکاردەهێنرێت و لەگەڵ چۆنیەتی داتاشین و بەدەست هێنانی بەشێوەی کۆتایی ئاشکرای ئامارییەوە.

3)**ئاماری بەجێهێنان:-**(APPLIED STATISTICS)بریتییە لە پراکتیزەکردنی ئامرازەکانی ئامار لە بواری دیاریکراودا،ئەمەش پێویستی بەشارەزایی لەڕێگاکانی ئامارەوە هەیەو لەگەڵ ئارەزووی گەورە لە بواری توێژینەوەدا، وەك بوارەکانی(ئابووری،کارگێری،پیشەسازی،پەروەردە،کۆمەڵناسی.........هتد

## 1-3:- پۆلێن کردنی زانستی ئامار:-دەتوانرێت ئامار بۆ دوو بەشی سەرەکی پۆلێن بکەین:-

1)**ئاماری باسەنی**(DESCRIPTIVE STATISTIES) هەموو شتێك گرنگی بە پرۆسەی کۆکردنەوەو شیکردنەوەو ڕاڤەکردن و نوێنەربوونی داتاکان دەدات، هەموو ئەمانەش بۆ زانستی ئامار دەگەڕێتەوە، وەك هەژمارکردنی تێکڕای خەرجی مانگانەی خێزان یان کۆکردنەوە و خستنەڕووی داتاکانی ڕووداوی کۆمەڵایەتی، وەك ژنهێنان و تەڵاقدان، یان بۆزانینی ڕای کۆمەڵگا لەبارەی گیروگرفتێکی دیاری کراوەوە، ئەویش لەمیانەی ئەنکێتی پرسینەوەدا، هەتا دەتوانرێت لێکۆڵینەوە لە یاساکانی ڕێککای ڕەفتاری نیوترۆنەکان و ئەلکترۆنەکان بکرێت. لەسەر ئەم بنچینەیەدا ئاماری باسەنی بەکاردەهێنرێت بۆ باسکردنی ڕاستییەکان و گۆڕینی بۆ ژمارەو خستنەڕووی شێوەی گونجاو، ئەویش بەبەکارهێنانی خستنەڕووی داتاکانەوە (GRAPHIC PRESENTATION) ، کە گوزارشت لە داتا ئامارییەکان دەکات،ئەویش لەمیانەی خشتەکان یان نەخشەکان یاخود شێوە هێڵکارییەکان، بە ئامانجی پێدانی وێنەیەکی گشتی لەبارەی ئاراستەی دیاردەیەك، لەو شێوە هێڵکاریانەش (ستوونی لاکێشەکان،چەماوەکان،بازنەکان....هتد)دێت. هەروەکو دەگوترێت، کە شێوەیەکی

هێڵکاری له ڕوونکردنەوەی دیاردەیەکدا دەوڵەمەندترە لەهەزار ووشە. لەلایەکی دیکەدا ئاماری باسەنی بریتییە لە لێکۆڵینەوەی ماتماتیکی، کە لە ڕێگایەوە دەتوانرێت هەژماری هەندێك لە ئامازەکانی ئامار بکرێت، وەك پێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی ،وەك ناوەندی هەژمارکردن ،ناوەڕاست، ژمارە زۆر دووبارەبووەوەکان....هتد.هەروەها پێوەرەکانی پەرشوبڵاوی وەك مەودا،لادانی پێوانەیی،جیابوونەکان....هتد،سەرباری پێوەرەکانی پەیوەندی نێوان دوو دیاردە، یان زیاتر، وەك هاوکۆلکەی پێکەوەلکان....هتد.

2)**ئاماری شیکردنەوە:-**(INFERENCE STATISTICAL)ئاماری شیکردنەوەیی گرنگی بە بژاردەی کۆمەڵگای توێژینەوە دەدات، بۆ ئەمەش ئەمانەی خوارەوە بەکاردەهێنرێت:-

أ)**مەزندەکردن:-**(ESTIMATION)دەتوانرێت بژاردەی کۆمەڵگای توێژینەوە لەمیانەی مەزەندەکردنی خاڵی (POINT ESTIMATION) ئەنجام بدرێت، وەك مەزەندەی تێکرای کۆمەڵگا لەمیانەی مەزندەی ناوەندی هەژمارکردن یان مەزەندەکردنی یەك ژمارەدا بۆ (INTERVAL ESTIMATION) بژاردەی کۆمەڵگای توێژینەوەکە بکرێت، سەرباری مەزەندەکردنی ماوەیی ئەویش لەشێوەی ماوەی نێوان ڕادەی بەرزو ڕادەی نزمدا بە پلەی متمانە یان ئەگەرێکی دیاریکراوەوە،کە دەکەوێتە نێوان ئەو دوو ماوەیە.

ب)**ئەزموونی گریمانەکان:-** (TEST OF HYOTHESIS)واتە بەکارهێنانی داتاکان، کە کۆکراوەتەوە لە کۆمەڵگا لەڕێگای بژاردەوە و لەگەڵ ئامازەی ئاماری مەزەندەکراو لەبارەی دیاردەیەکی توێژینەوە، بەمەبەستی گەیشتن بەبڕیارێك سەبارەت بە گریمانەکانەوە، کە لەسەرەتای توێژینەوە وەك ڕاڤەیەکی کاتی دادەنرێت بۆ ئەو دیاردەیەو ڕەنگە بڕیاریش بە پەسەند یان ڕەتکردنەوەی گریمان بدرێت.

## 4.1:-داتا ئامارییەکان:-

بریتییە لە کۆمەڵێك ڕاستی و زانیاری،کە پەیوەندیدارە بە دیاردەیەکی توێژینەوەو بەکەرستەیەکی سەرەتایی زانستی ئامار دادەنرێت. داتاکانیش بۆ چەند بەشێك دابەش دەبن،کەدەتوانرێت لەمیانەی ئەو هێڵکارییە کورت بکرێتەوە:-

**هێلکاری( 1-1 )**

**بەشی داتاکان**



لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانریت گۆڕاو (**variable**) بەوە پێناسە بکرێت، کە بریتییە لە خاسیەتێك کە بەهای جۆراو جۆر بە جیاوازی کەسەکان، یان شوێنەکان یاخود شتەکان لەخۆ بگرێت، هەرکاتێك درێژی یان کێش یاخود تەمەنی کەسێکمان دیاری کرد، ئەوا ئەنجامەکەی هەمیشە گوزارشت لە بەهای ئەو گۆڕاوە دەکات، کاتێکیش هۆکاری رێککەوت دەخەینە نێو بەها دەرهاتووەکان، ئەوا گۆڕاو لەم دۆخەدا پێی دەگوترێت رەمەکی (**Random variable**)، بەهای هاتووە دەستی کردەی پێوانە کردن زۆرجار گوزارشتی ئەوەی بۆ دەکرێت، کە بینەرەکانن یان پێوانەکانن.

سەرچاوەکانی داتاش بۆ دووبەش دابەش دەبن:—

1) **سەرچاوەی مەیدانی ڕاستەوخۆ:**-لێرەدا تویژەر بەخودی خۆی هەوڵی بەدەست هێنانی ڕاستی و زانیارییەکانی لەبارەی دیاردەی توێژینەوەکەی دەدات، وەك (پرسینەوە...هتد).

2) **سەرچاوەی فەرمی و مێژووییەکان:**-لێرەدا دام و دەزگاکان ئەرکی دابینکردنی داتا ئامارییەکانی دیاردە ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەندروستی و ڕۆشنبیری و زانستی و ...هتد دەگرنە ئەستۆ.

## 5-1:-کۆمەڵگای ئاماری:-(statistical population)

کۆمەڵگا بریتییە لە هەموو بەها و تاکەکان کە دەتوانرێت وەك گۆڕاو وەربگیرێت، کە ئارەزووی بەدەست هێنانی دەرئەنجام لەبارەیەوە دەکرێت،ئەمەش جێگای گرنگی توێژەرە یان بڕیاردەرە، بۆ نموونە ئەگەر لێکۆڵینەوەکەمان سەبارەت بەدەستهاتی مانگانەی فەرمانبەرانی کۆلیژی ئابووری و کارگێڕی زانکۆی سەلاحەددین بێت، ئەوا لەم دۆخەدا کۆمەڵگای ئامار بریتییە لە فەرمانبەرانی ئەو کۆلیژەی زانکۆی ناوبراوەوە.کۆمەڵگاش دابەش دەبێت بۆ کۆمەڵگای سنووردار (**finite population**)، ئەمەش بریتییە لەو کۆمەڵگایەی، کە دەتوانرێت کۆنترۆڵی ژمارەی تاکەکانی بکرێت، هەر وەکو دەستهاتی فەرمانبەرانی کۆلێژی کارگێڕی وئابووری لەزانکۆی سەلاحەددیندا، یان کۆمەڵگای بێ سنوور (**infinite population**) دەبێت، ئەمەش ئەو کۆمەڵگایەیە کە ناتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت واتە ناتوانرێت ژمارەی تاکەکانی کۆنترۆڵ بکرێت، وەك ماسی ناو دەریا، ئەستێرەکانی بۆشایی ئاسمان.

**6-1:- بژاردە(sample)**: بژاردە بریتییە لە بەشێکی کۆمەڵگە، ئەمەش بریتییە لە کۆمەڵێك بینەر، کە بەڕێگایەك لە ڕێگاکان بژاردە کراوە، ئینجا کاتێك ناتوانرێت لێکۆڵینەوە لە هەموو کۆمەڵگا بکرێت، ئەویش بەهۆی پەیوەندیدار بوونی بەکات و هەوڵ هەیە،سەباری نزم کردنەوەی تێچوون یاخود ئەستەمی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە بۆ هەموو کۆمەڵگا،بۆیە پشت بە وەرگرتنی بژاردە و خاسیەتەکانی دەبەستین،بەمەش دەتوانین دەرئەنجامی خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای بنەڕەتی بکەین، کە بژاردەکەی لێوەرگیراوە، ئینجا سەرەڕای لایەنە چاکەکانی بەکارهێنانی بژاردە، بەڵام هەڵبژاردنی بژاردە ڕووبەڕووی دوو جۆر هەڵەی سەرەکی دەبێتەوە، ئەویش بریتییە لە:-

**1-هەڵەی ڕێککەوت یان هەڵەی بێ مەبەست:-** هەڵەی ڕەمەکیشی پێ دەوترێت، ئەمەش بریتییە لە هەڵەی ئاماری بێ مەبەست لەئەنجامی وەرگرتنی بژاردە لە کۆمەڵگا دروست دەبێت، مەرجیش نیە هەمیشە بەشێك نوێنەرایەتی هەموو کۆمەڵگا بکات، دەتوانرێت بەسەر ئەو جۆرە هەڵەیە زاڵبێت، ئەویش لەڕێگای هەڵبژاردنی باشترین ڕێگا لەپرۆسەی هەڵبژاردنی بژاردە، یان لەڕێگای زیادکردنی قەبارەی بژاردە، هەرکاتێك قەبارەی بژاردە زیادی کرد، ئەوا باشتر نوێنەرایەتی کۆمەڵگای ئاماری دەکات.

**2-هەڵەی ئەنقەست:-**ئەمەش بریتییە لە هەڵەی بەئەنقەست ، چونکە بەشێوەی ئەنقەست لەلایەن توێژەر ئەنجام دەدرێت کەهەڵدەستێت بە هەڵبژاردنی تاکی بژاردەکە بەشێوەی ئەنقەست بۆ بەرژەوەندی توێژەرێکی دیاریکراو، یان چینێکی دیاریکراو.لێرەدا زیادکردنی قەبارەی بژاردە بەشێوەی ئەنقەست دەبێتە هۆی زیادبوونی قەبارەی هەڵەکان.دەتوانرێت بەسەر هەڵەی بەئەنقەست زاڵ بین،ئەویش لە ڕێگای پلاندانانی باش بۆ هەڵبژاردن و جێبەجێکردنی بژاردەکە. هەروەها پێداچوونەوەی بەردەوام بۆ پێوەری هەڵبژاردنەکە،سەرباری پشت بەستن بە شارەزاییان لەم بوارەدا

***دیاریکردنی قەبارەی بژاردە:-**کاتێك قەبارەی بژاردە دیاری دەکرێت، ئەوا هاوشێوەبوونی یەکەکانی کۆمەڵگەو مەودای متمانە لەبەرچاو دەگرێت، کە دەبێت توێژەر لە توێژینەوەکەی خۆی پەیوەست بێت پێیەوە.ئینجا ئەگەر بێتو پلەی هاوشێوە بوون لەنێوان یەکەکانی کۆمەڵگە گەورەبوو، ئەوا توێژەر دەتوانێت بژاردەیەکی قەبارە بچووك وەربگرێت، بەڵام ئەگەر بێتو کۆمەڵگەدا هاوشێوە نەبوو، ئەوا پێویستە قەبارەی

بژاردەکە گەورە بێت، هەروەها لەدیاریکردنی قەبارەی بژاردە توانای دارایی و کاتیش لەبەرچاو دەگیرێت،کە ڕەنگە بەهۆیەوە بژاردەیەکی کەمتر لە قەبارەی گونجاو وەربگیرێت.

***ڕێگاکانی بژاردەکردن:-** شێوازی دیار کردنی بژاردە پێی دەوترێت بژاردەکردن (SAMPLING)،بژاردەش بریتییە لە کۆمەڵێك یەکە(SAMPLING UNITS)کە لە چوارچێوەی بژارکردن(SAMPLING FRAME) هەڵدەبژێرێت، کەپێك دێت لە تاکەکان یان خێزان یاخود یەکەکانی بەرهەم،بژاردەکانیش ئەنجامی بەرزو وورد دەدەنە دەستەوە،کە هاوکۆك دەبێت بەشێوەی ڕاستەوانە لەگەڵ پلەی نوێنەرایەتی داتاکانی کۆمەڵگە بۆ ئەمەش دوو کۆمەڵەی سەرەکیمان لەدیاریکردنی بژاردەکان هەیە،کە بریتییە لە:-

**یەکەم:- ڕێگا ڕەمەکییەکان:-(RANDOM SAMPLES)** بریتییە لەو ڕێگایانەی، کە پەیوەندیدارە بە هەڵبژاردنی تاکی بژاردەکان بەشێوەی ڕەمەکی، بە واتای ئەوەی هەرکاتێك لە کۆمەڵگا هەلی یەکسانی لەگەڵ هەلی هەر تاکێکی دیکە لە بژاردەکەدا هەیە، بۆنموونە ئەگەر بێتو ژمارەی تاکەکانی کۆمەڵگا (1000)بێت، ئەوا هەلی بەدیارکەوتنی هەر تاکێك لە بژاردەکەدا یەکسانە بەیەك لە هەزاردا.لە گرینگترین جۆرەکانی بژاردە ڕەمەکییەکانیش بریتین لە:-

**1-بژاردەی ڕەمەکی سادە:-** (SIMPLE RANDOM SAMPLE) بە ئاسانترین جۆرەکانی بژاردە دادەنرێت، ئەویش ئەوکاتەی یەکەکانی کۆمەڵگای توێژینەوە لە دۆخی هاوشێوەیی دان، لێرەدا هەل بۆ هەریەکەیەك لە یەکەکانی کۆمەڵگا بۆ بە دیارکەوتن لە بژاردەکە بە ئەگەرێکی یەکسان و سەربەخۆ دادەنرێت لە نێو ئەو ڕێگایەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ هەڵبژاردنی ڕەمەکی بریتییە لە ڕێگای تیروپشك، ئەویش لەڕێگای نووسینی ژمارەی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگای بنچینەیی لەسەر پسوڵەی بچووك، دوای تێکدانی بەشێوەیەکی باش، ژمارەیەکی بە ڕێگای ڕەمەکی لێ ڕادەکێشین، کە نوێنەرایەتی بژاردەی توێژینەوە دەکات، یان لە ڕێگای بەکارهێنانی خشتەی ژمارەیی ڕەمەکی، بە تایبەتی کاتێك قەبارەی بژاردەکە گەورە دەبێت، کە لە ستوون و ئاسۆیی پێك دێت، کە ستوونی و ئاسۆیی بە شێوەی ڕەمەکی لە خشتەیەك هەڵدەبژێرێت، ئینجا

ژمـارەی خانــە ژمارەیـەکی گونجـاوی گـەورە لـە کۆمەڵگاکـە دیاریـدەکرێت،دوای ئـەوە تاکـەکان بــەپێی زنجـیرەی ژمــارەیی نــاو خشــتەکە بەشــێوەی ســتوونی و ئاســۆیی هەڵدەبژێردرێت،تا ژمارەی پێویستی بژاردەی توێژینەوەکە تەواو دەبێت. چـەند ڕێگایـەك بۆ دیاریکردنی قەبارەی بژاردەی ڕەمەکی سادە هەیە، لەوانە:–

أ) دیاریکردنی قەبارەی بـژاردە لەســەر بنچینەی نێـوەنجی:– ئەمـەش لـە میانـەی پڕاکتیزەکردنی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە دێتە دەست:–

$$n = \frac{z^2\sigma^2}{e^2} \qquad \ldots \quad (1.1)$$

–بریتییە لە قەبارەی بژاردەn:

–بەهای پێوەری بۆ گۆڕاوێکی دیاریکراوz:

:–جیاوازی کۆمەڵگا $\sigma^2$

–هەڵەی ڕێپێدراو e:

نموونە:–ئەگەر بێتو کۆمەڵگای توێژینەوە یەکسان بێت بە(5)وئاستی متمانـەی پێویسـت (95٪)بێـت و هەڵـەی ڕێپێـدراویش یەکسـان بێـت بـە(0.01)،ئـەوا قـەبارەی بـژاردەی پێویست:–

$$n = \frac{(1.96)^2(5)}{(0.01)^2} = 192080$$

ب-دیاریکردنی قەبارەی بژاردە لەسەر بنچینەی ڕێژەیی:–ئەمەش دەتوانرێت لـە میانـەی ئـەم هاوکێشەیەی خوارەوە پڕاکتیزە بکرێت:–

P:–ڕێژەی سەرکەوتنی گریمانەیی لە کۆمەڵگا.

نموونـە:–گریمـانی ئــەوە دەکـەین، کـە لـە نێـو هـەر (10) پەیوەنـدی کـردن لەگـەڵ مامەڵەکاراندا، یەك کردە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت. قەبارەی بژاردە چەند دە بێـت؟ ئەگەر بێتو ئاستی متمانەی پێویست (95٪) بێت و هەڵەی ڕێپێدراویش (0.05) بێت.

$$n = \frac{(1.96)^2(0.10)(1-0.10)}{(0.05)^2} \approx 138$$

**2-بژاردەی ڕەمەکی چینی:-(stratified random sample):** لێرەدا کۆمەڵگای بنەڕەتی توێژینەوە بۆ چەند چینێکی ناهاوشێوە دابەش دەکات،لە هەمان کاتدا هەر چینێك لە تاکی هاوشێوە لەنێوخۆیاندا پێك هاتووە.ئینجا بەشێوەی ڕەمەکی لەو چینانە ژمارەی پێویست دیاری دەکرێت،بەشێوەیەك بگونجێت لەگەڵ قەبارەی هەرچینێك لە چینەکانی کۆمەڵگا.ئەم جۆرە ڕێگایەش دەبێتە هۆی زیادبوونی نوێنەرایەتی بژاردەکە،بەمەش توێژەر دەتوانێت بژاردەی بچووکتر وەربگرێت،ئەمەش خەرجی توێژەر کەم دەکاتەوە.

**3 )بژاردەی قۆناغە جیاجیاکان:- (multi-stage random sample)**، بریتییە لە بژارارکردن لە کۆمەڵەکان،ئینجا بژاردەیەکی ڕەمەکی سادە لەو کۆمەڵانەی کۆمەڵگاکە ڕادەکێشرێت.ئینجا سەرژمێری گشتگیر بۆ هەموو تاکی کۆمەڵەکان،کە هەڵبژێردراون ئەنجام دەدات،یان هەڵدەستێ بە بژارکردنی هەموو کۆمەڵە هەڵبژارکردووەکان(بەدووقۆناغ)دەتوانرێت قۆناغی دیکەی بژارکردن بەپێی سروشتی توێژینەوەکە زیاد بکرێت،ئەو کاتەش بەبژاردەی قۆناغە جیاجیاکان دەناسرێت.بۆ نموونە کاتێك توێژینەوەی کشتوکاڵی ئەنجام دەدرێت بۆ کشتوکاڵی دانەوێڵەیەك،سەرەتا گوندەکان وەك یەکەی سەرەتایی وەردەگیرێت،ئینجا کێڵگەکان وەك یەکەکی ناوەندی و دوای ئەوەش پارچە زەوی لە کێڵگە بژاردەکان وەردەگیرین ئەمەش لە سێ قۆناغ پێك دێت.

**4 )بژاردەی ڕەمەکی ڕێکخراو:- Systematic Random Sample** : ئەم ڕێگایە لە دۆخی هاوشێوەیی کۆمەڵگای بنەڕەتی یان ڕەمەکی بەکار دەهێنرێت، هەڵبژاردنی تاکەکان بە ماوەی یەکسان دەبێت، سەرەتا یەکەی یەکەمی بژاردەکە بەڕێگای ڕەمەکی دەبێت، بەمەش تاکەکانی دیکە بژاردەکە دیاریدەکات، بۆ نموونە ئەگەر ویستمان بژاردەیەك لە قوتابیانی بەشی ئابووری بە ڕێژەی (10٪) وەربگرین، کە ژمارەیان (500) قوتابییە، لەم دۆخەدا قەبارەی بژاردەکە (0.10X500) یەکسان دەبێت بە (50) قوتابی، هەروەها هەڵبژاردنی هەر تاکێك لەتاکەکان پشت بە قەبارەی بژاردەکە و قەبارەی کۆمەڵگا دەبەستێت جاری وا هەیە (1– 8) دەبێت، یان (1–15) دەبێت...هتد، ئەگەر بێتو ویستمان لە هەر (10) قوتابی یەك قوتابی وەر بگرین، ئەوا

قوتابی یەکەم بەشێوەی ڕەمەکی بژاردەکەین، ئینجا بۆ دیاریکردنی قوتابی دووەم، ئەوا کۆی ژمارە (10)ی یەکەم دەکەین، بەم شێوەیە ئەگەر بێتو ژمارەی قوتابی یەکەم (6) بێت، ئەوا کۆی ژمارە (10)ی دەکەین، بە شێوەیەك تا قەبارەی بژاردەکە تەواو دەبێت (6،16،26،36...هتد).

**2) ڕێگا نارەمەکییەکان: (No random sample)** : لێرەدا یەکەکانی بژاردە بەشێوەی ڕێککەوت واتە بێ مەبەست یان

یەکەکانی بژاردە بە شێوەی مەبەست دیاری دەکرێت بە مەبەستی دیار کردنی لێکۆڵینەوەی دیاریکراو، لە جۆرەکانی بریتییە لە:

1)**بژاردەی بە ڕێککەوت**:- (ACCIDENTAL SAMPLE) لێرەدا توێژەر هیچ دەستێخستنی لە دیاریکردنی بژاردەکە نییە، ئەگەر بێتو توێژەر بیەوێت ڕای گشتی لە بەرامبەر مەسەلەیەك بزانێت، ئەوا دادەبەزێتە سەر شەقام و ڕێککەوتی یەکەم کەس دەکات و پرسیاری لێ دەکات، ئەمەش دووبارە دەبێتەوە تا قەبارەی بژاردەکەی تەواو دەبێت.

1. **بژاردەی بەشی**:- Quota Sample

لێرەدا کۆمەڵگا دابەش دەکرێت بۆ چەند توێژێك و لە هەر توێژێکیش، کۆمەڵە تاکێك وەردەگیرێت، کە نوێنەرایەتی دەکات، دیارکردنی بژاردەکەش بە گوێرەی پێویست دەبێت، نەك بەشێوەی ڕەمەکی، ئینجا کاتێك توێژەر کۆمەڵگا بۆ توێژی خەسڵەتداری دیاریکراو دابەش دەکات وەك (قوتابی، مامۆستا، کرێکار...هتد)، ئینجا هەڵدەستێت بە هەڵبژاردنی هەرتوێژێك لە کۆمەڵەکە، بەبێ ئەوەی بژاردەکە بەشێوەی ڕەمەکی، لێرەدا بواری تاکە جیاوازی نێوان بژاردەی چینی و بژاردەی بەش بریتییە لە بواری هەڵبژاردنی تاکەکان.

2. **بژاردەی مەبەستدار(Purposive sample)**:-

بۆ بەکارهێنانی ئەو ڕێگایە پێویستە توێژەر شارەزایی لە ئامارەکانی ئاماری کۆمەڵگای بنەڕەتی هەبێت.ئینجا یەکەکانی بژاردە لە ڕوانگەی ئەم شارەزاییەوە دیار دەکرێت،ئینجا یەکەی دیاریکراو هەڵدەبژێردرێت،کەوای بۆ دەچێت نوێنەرایەتی کۆمەڵگای بنەڕەتی دەکات.ئەگەر بێتو توێژەر بیەوێت توێژینەوە لەڕای گشتی لەبارەی

مەسـەلەیەکی دیـاریکراودا بکات،ئـەوا پیـاوانی سیاسـەتمەدارو کەسـانی دیکـە بـۆ ئـەو توێژینەوەیە هەڵدەبژێردرێن ئەو جۆرە بژاردەیە نوێنەرایـەتی کۆمـەڵگا ناکات،بـەڵکو ئـەو جـۆرە بژاردەیـە نوێنەرایـەتی کۆمـەڵگا ناکات،بـەڵکو نوێنەرایـەتی ڕای کەسـەکانی نێـو بژاردەکە بەتەنهادەکات.

# ڕاهێنانەکانی بەشی یەکەم

**1-1**:-پێناسەی ئامار بکەو جۆرەکانی باس بکە؟

**2-1**:-قۆناغەکانی پرۆسەی ئامار بژمێرە؟

**3-1**:-جیاوازی نێوان ئاماری باسەنی و ئاماری شیکردنەوەیی بکە؟

**4-1**:-گرنگی ئامار بۆ زانستی کارگێری و ئابووری چییە؟

**5-1**:-جیاوازی نێوان بژاردەو کۆمەڵگا چییە؟

**6-1**:-کامە ڕیگای بژاردە زۆرترین بەکارهێنانی لەژیانی پراکتیکی دا هەیە؟باسی بکە؟

**7-1**:-ئەگەر بێتو جیاکاری کۆمەڵی توێژینەوە یەکسان بێت بە (25) و ئاستی متمانەی پێویست(99٪)،هەڵەی ڕێپێدراویش یەکسانە بە(0.05)، قەبارەی بژاردەی گونجاو چەندە؟ ئەویش بە بەکارهێنانی بژاردەی ڕەمەکی سادە لەسەر بنچینەی نێوەنجی دا.

**8-1**:-ئەگەر بێتو ڕێژەی سەرکەوتنی قوتابیانی بەشی ئابووری لەکۆمەڵگای توێژینەوە یەکسان بێت بە (0.80)،وئاستی متمانەی پێویست (95%) ، هەڵەی ڕێپێدراویش یەکسانە بە(0.10) قەبارەی بژاردەی گونجاو مەزندە بکە؟بە بەکارهێنانی بژاردەی ڕەمەکی سادە لەسەر بنچینەی ڕێژەیی.

**9-1**:-یەکێك لە توێژەران ئارەزوومەندی دیاریکردنی ڕێژەی بژاردەی بە(20٪)کردووە، لەسەرجەمی ژمارەی فەرمانبەران کەبریتییە لە (5000) فەرانبەر.بژاردە چۆن دەبێت بەپێی ڕێگای بژاردەی ڕەمەکی ڕێکخراو؟

## 1.2 : پێشەکی:( Introduction )

ئەو داتایانەی کە بەشێوازی بـژاردە کۆدەکرێتـەوە، بـێ سـوود دەبێـت، ئەگـەر بێتـو ڕێکنەخرێت و نەکرێتە خشتە، بۆیە پرۆسەی داتاکان بە هەنگاوی بنـەرەتی بـۆ پرۆسـەی شیکردنەوەی داتاکان دادەنرێت، دوای ئەوە بە دەستهێنانی دەرئەنجام لە میانەی پـۆلێن کردنـی داتاکـان و خسـتنەڕووی، بـە شـێوەیەك ببێتـە هـۆی پێـدانی شـێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆ تێگەیشتنی خەسڵەت و پێکهاتەکانەوە، کە ڕێگا خۆشکەرە بۆ بە دەستهێنانی دەرئەنجامی قوڵتر و کرێگاریی لەقۆناغەکانی شیکردنەوەی ئایندە دەبێت، لەسـەر ئـەو بنەمایـە لـەم بەشـەدا جـەخت لەسـەر شـێوازی پـۆلێن کردنـی داتاکـان لەخشـتەکان دادەکەینـەوە بەتایبـەتی خشـتەکانی دابەشـکردنی دووبـارەیی، هـەروەها خسـتنەڕووی داتاکان بەشێوەی ئەندازەیی.

## 2.2 : خســـتنەڕووی خشـــتەی داتاکـــان :- (Frequency distribution)

لەمیانـەی ئـەم برگەیـەدا داتـا خاوەکـان یـان سـەرەتاییەکان کـە کۆدەکرێتـەوە، بـە بـەکارهێنانی بـژاردە، کـەپێ ی دەگوترێـت داتـای نـاڕێکخراو، کـە ئەمـەش دەگۆڕدرێـت بۆداتای ڕێکخراو، ئـەویش بەپشـت بەسـتن بەخشـتەی تایبـەت، کـە ناسـراوە بـە دابـەش کردنی دووبارەیی، کە لە میانەیدا داتای پۆلێنکراو دەخرێتەڕوو.

### 1-2-2 :- دابەش کردنی دووبارەیی :- (frequency distribution)

دابـەش کردنـی دووبـارەیی بریتییـە لـە پوخـت کـردن و ڕێکخسـتنی داتاکـان، کـە کۆکراوەتەوە و پولێن کراوە، و بۆ ژمارەیەك کۆمەڵەش دابەش کراوە، کە پێـی دەوترێـت توێژ (class)، ئەو تویژانەش ڕێکخراوە بە شێوەی بەرزبوّوە و نزم بوونـەوە دا بـەپێ ی سروشتی داتاکـان، کـە بـە دابەشـکردنی ژمـارەی بـەهای (×) دەوترێـت، ئـەویش بـەپێی توێژەکان (دابەشکردنی دووبارەیی)، توێژی دابەشکردنی دووبارەیی لەدرێژی دا یەکسـان و نـا یەکسـانیش دەبێـت. گریمـان (×n...×2،×1) مـان هەیـە، نوێنەرایـەتی بـژاردەی ڕەمەکی بـە قـەبارەی (n) لـە بینـەرەکان دەکـات، کـە ئارەزوومەنـدی پـوختکردنی ئـەو

داتایانەن، لە دابەشکردنی دووبارەبوونەوەی ژمارەی توێژەکانی (m)ن، کە ئەمانەی خوارەوەمان هەیە:-

**مەودای هەمووەکی:- Total Range**

بریتییە لەجیاوازی نێوان گەورەترین بەهای ($X_L$) وبچووکترین بەهای($X_S$) لە کۆمەڵێکدا، کە ژمارە ( $x_1$ ) ی بۆ زیاردەکرێت، واتە:-

$$T.R = x_L - x_S + 1 \qquad \cdots \quad (2.1)$$

**ژمارەی توێژەکان :- (Number of classes):** ژمارەی توێژەکان بریتییە لە ژمارەیەك کۆمەڵە کە خشتەی دووبارەیی لێ پێك دێت، چەند دەقێکیش هەیە، کە لە میانەیدا ژمارەی توێژەکانی خشتە دیاری دەکات، لەوانە ڕێگای یول (Yule) کە بریتییە لە:-

$$m = (2.5)\sqrt[4]{n} = (2.5)n^{1/4} \qquad \cdots \quad (2.2)$$

ئەگەر بێتو n=50، ئەوا ژمارەی توێژەکان بریتی دەبێت لە:-

$$m = (2.5)\sqrt[4]{50} = (2.5)(50)^{1/4}$$
$$= (2.5)(2.659) = 6.6475 \cong 7$$

یان بەکارهێنانی دەقی ستەرجس(sturges)کە بریتییەلە:-

$$m = 1 + (3.322)\log_{10}(n) \qquad \cdots \quad (2.3)$$

ئەگەر بێتو(n=50)ئەوا ژمارەی توێژەکان بەپێ ی ئەم دەقە بەم شێوەیە دەبێت:-

$$m = 1 + (3.322)\log_{10}(50)$$
$$= 1 + (3.322)(1.69897) = 6.644 \cong 7$$

لێرەدا ئەنجامەکان بۆ ژمارەی تەواو نزیك دەکرێتەوە، چونکە دەبێ ژمارەی توێژەکان ژمارەی تەواو بن.

## *درێژی توێژ(Length of class)

برتییە لە بڕی ماوەی نێوان نزمترین ڕادەی توێژ و بەرزترین ڕادەی توێژدا، ماوەی توێژێش (L)هاوكۆك دەبێت بەشێوەی پێچەوانەیی لەگەل ژمارەی توێژەكاندا، هەر كاتێك درێژی توێژ زیادی كرد،ئەوا ژمارەی توێژەكان كەم دەكات، پێچەوانەكەشی راستەكەیەتی، هەروەها لە دۆخی خشتەی توێژی یەكسان لە درێژی دا، دەتوانرێت درێژی توێژ(L)لە میانەی ئەم هاوكێشەیە دیار بكرێت:

$$L = \frac{T.R}{m} \qquad \cdots \quad (2.4)$$

## نزمترین ڕادەو بەرزترین رادەی توێژ:- Lower and Upper Limit of ( class )

هەموو خشتەیەكی دووبارەیی سەرەتاو كۆتایی هەیە، سەرەتا واتا نزمترین ڕادەی توێژL.L، لەهەمان كاتدا كۆتایی واتە بەرزترین ڕادەی توێژ U.L. دەتوانرێت سنووری توێژەكان لەدۆخی یەكسان بوونی درێژییان بەم شێوەی خوارەوەبێت:-

| بەرزترین ڕادە | نزمترین ڕادە | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|
| $x_S + L$ | $x_S$ | 1 |
| $x_S + 2L$ | $x_S + L$ | 2 |
| $x_S + 3L$ | $x_S + 2L$ | 3 |
| $\vdots$ | $\vdots$ | $\vdots$ |
| $x_S + mL$ | $x_S + (m-1)L$ | M |

**تێبینی:**-خشتەی پێشوو ئاستی داتا بەردەوامەكان دیاری دەكات، بەڵام ئەگەر بێتو داتاكان لە جۆری پچڕاو بن،ئەوا ژمارە(1)لەبەرزترین ڕادەی توێژەكە دەردەكرێت.

**ناوەندی توێژ:**-(Center of a class)بەهای (x)كە دەكەوێتە نێوان بەرزترین ڕادەو نزمترین ڕادەی توێژەكان،ئەمەش بریتییە لە ناوەندی توێژ،واتە:-

$$x = \frac{L.L + U.L}{2} \qquad \cdots \quad (2.5)$$

***دووبارەی توێژ:-*(Class frequency):بریتییە لەژمارەی بینەران،کە دەکەوێتە چوار چێوەی ئەو توێژە،بەجۆرێك سەرجەمیان بریتییە لە قەبارەی بژاردە(n)، ئەگەر بێتو دووبارەنوونەوەی بەم هێمایانە بێت $(f_1, f_2, \ldots, f_m)$ ئەوا:

$$\sum_{i=1}^{m} f_i = f_1 + f_2 + \cdots + f_m = n$$

ئەوەی تێبینی دەکرێت، ئەوەیە پێویست ناکات نزمترین ڕادەی توێژی یەکەم یەکسان بێت بە بچووکترین بەهای کۆمەڵەکە، بەڵکو پێویستە کەمتر بێت، هەروەها بەرزترین ڕادەی دوا توێژ مەرج نییە یەکسان بێت بەبەرزترین بەها، بەڵکو ڕەنگە گەورەتر بێت، ئەمەش بۆ ئاسانکردنی کردەی هەژمارکردنە، هەروەها ڕەنگە خشتەی دووبارەبۆوە داخراو بێت (خاوەنی نزمترین ڕادەی توێژی یەکەم و بەرزترین دوا توێژ دەبێت)، یان کراوە دەبێت (خاوەنی نزمترین ڕادەی توێژی یەکەم وبەرزترین ڕادەی دوا توێژ نابێت)، ئەویش لەبەر ئەوەی پشت بە سروشتی توێژینەوەکە دەبەستێت، بۆ نموونە:- کریێ ی ڕۆژانەی کرێکار هەزار دینار بۆ کەرستەی خانووبەرە بەم شێوەی خوارەوەیە:

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 29 | 38 | 37 | 35 | 30 | 26 | 41 | 37 | 34 |
| 30 | 44 | 42 | 37 | 33 | 31 | 27 | 40 | 38 |
| 32 | 28 | 49 | 40 | 39 | 34 | 30 | 39 | 35 |
| 39 | 31 | 33 | 26 | 44 | 31 | 31 | 46 | 43 |
| 38 | 35 | 35 | 32 | 45 | 36 | 32 | 34 | 48 |

**داواکاری:-** ئەم داتایانە لە خشتەی دووبارەیی ڕێك بخە و شیکاری بکە

**شیکار:-** n=45 و ژمارەی توێژەکانm بەو شێوەیەیە:-

$$m = (2.5)\sqrt[4]{45} = (2.5)(45)^{1/4}$$
$$= (2.5)(2.59) = 6.475 \cong 6$$

لەخشتەی پێشوو سەرنجی ئەوە دەدەین، کە بچووکترین بەها($X_S=26$)و گەورەترین بەها($X_L=49$)لەبەر ئەوە مەودای هەمووەکی بریتییە لە:-

$$T.R = x_L - x_S + 1 = 49 - 26 + 1 = 24$$

لەبەرئەوە درێژی توێژ:-

$$L = \frac{T.R}{m} = \frac{24}{6} = 4$$

لەسەر ئەو بنچینەیە دەتوانین ئەم خشتە دروست بکەین:-

| زنجیرەی توێژ | کەمترین ڕادەی توێژ | بەرزترین ڕادەی توێژ | سنووری توێژ بەشێوەی کۆتایی |
|---|---|---|---|
| 1 | 26 | 29 | 29-26 |
| 2 | 30 | 33 | 33-30 |
| 3 | 34 | 37 | 37-34 |
| 4 | 38 | 41 | 41-38 |
| 5 | 42 | 45 | 45-42 |
| 6 | 46 | 49 | 49-46 |

دوای دیاریکردنی توێژەکان، هەڵدەستین بە بەتاڵکردنی داتاکان بەگوێرەی توێژەکان بەم شێوەی خوارەوە:

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان (کرێ) | دووبارەکان (ژمارەی کرێکاران) | دووبارە $f_i$ |
|---|---|---|---|
| 1 | 29-26 | 卌 | 5 |
| 2 | 33-30 | 卌 卌 // | 12 |
| 3 | 37-34 | 卌 卌 / | 11 |
| 4 | 41-38 | 卌 //// | 9 |
| 5 | 45-42 | 卌 | 5 |
| 6 | 49-46 | /// | 3 |

دەتوانرێت ئەنجامەکان پوخت بکرێت لەگەڵ ناوەندەکانی توێژ، ئەویش لەمیانەی ئەو خشتەیەی خوارەوە:-

| ناوەندەکانی توێژ | $f_i$ دووبارەکان(ژمارەی کرێکاران) | توێژەکان(کرێ) | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|---|
| 27.5 | 5 | 29-26 | 1 |
| 31.5 | 12 | 33-30 | 2 |
| 35.5 | 11 | 37-34 | 3 |
| 39.5 | 9 | 41-38 | 4 |
| 43.5 | 5 | 45-42 | 5 |
| 47.5 | 3 | 49-46 | 6 |

**نموونە**(2-2): ئەو داتایانەی خوارەوە بریتییە لە بەرهەمی گەنم لە دۆنمێك بۆ (60) پارچە زەوی کشتوکاڵ و **داواکاری**: بریتییە لە پێکهێنانی خشتەی دووبارەبوونەوەیی، سەرباری هەژمارکردنی ناوەندی توێژەکان:

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 69.55 | 48.71 | 35.71 | 34.35 | 17.83 | 26.91 | 72.35 | 36.82 | 38.51 | 41.15 |
| 41.82 | 44.23 | 49.20 | 33.21 | 32.72 | 27.82 | 28.91 | 73.48 | 39.61 | 39.26 |
| 70.75 | 70.22 | 38.22 | 32.43 | 33.81 | 30.61 | 29.50 | 36.43 | 64.22 | 51.22 |
| 70.25 | 43.53 | 62.02 | 31.15 | 34.52 | 78.89 | 52.41 | 37.42 | 38.17 | 59.11 |
| 42.91 | 50.31 | 41.23 | 32.23 | 35.02 | 42.15 | 54.61 | 72.81 | 50.71 | 58.51 |
| 68.72 | 39.21 | 40.40 | 61.22 | 41.23 | 51.52 | 51.22 | 56.21 | 57.31 | 39.19 |

**شیکار**:- $n=60$ و ژمارەی توێژەکان m بریتییە لە:-

$$m=(2.5)\sqrt[4]{60}=(2.5)(60)^{1/4}$$
$$=(2.5)(2.7832)=6.9579\cong 7$$

لە خشتەی پێشوو سەرنجی ئەوە دەدەین کە بچووکترین بەها ($x_S=17.83$)، گەورەترین بەها($x_L=78.89$) بۆیە مەودای هەمووەکی بریتییە لە:-

$$T.R=x_L-x_S+1=78.89-17.83+1=62.06$$

لەبەرئەوە درێژی توێژەکە بریتییە لە:-

$$L=\frac{T.R}{m}=\frac{62.06}{7}=8.8657$$

لەسەر ئەو بنچینەیە دەتوانین ئەو خشتەیە دروست بکەین :-

| زنجیرەیی توێژ | نزمترین ڕادەی توێژ | بەرزترین ڕادەی توێژ | سنووری توێژەکان بە شێوەی کۆتایی | دەتوانرێت بۆ ئاسانی بەم شێوەیە بنووسرێت |
|---|---|---|---|---|
| 1 | 17.83 | 26.70 | 26.70-17.83 | -17.83 |
| 2 | 26.70 | 35.56 | 35.56-26.70 | -26.70 |
| 3 | 35.56 | 44.42 | 44.42-35.56 | -35.56 |
| 4 | 44.42 | 53.28 | 53.28-44.42 | -44.42 |
| 5 | 53.28 | 62.15 | 62.15-53.28 | -53.28 |
| 6 | 62.15 | 71.02 | 71.02-62.15 | -62.15 |
| 7 | 71.02 | 79.88 | 79.88-71.02 | 79.88-71.02 |

دوای دیاریکردنی توێژەکان هەڵدەستین بە بەتاڵکردنی داتاکان بە پێی توێژەکان:

| زنجیرەیی توێژ | توێژەکان ( بڕی بەرهەمی گەنم بە تەن ) | دووبارەبوونەوەکان ( بە ئاماژە بۆ ژمارەی پارچە زەوییەکان ) | $f_i$ دووەبارە |
|---|---|---|---|
| 1 | 26.70-17.83 | / | 1 |
| 2 | 35.56-26.70 | //// 𝍸 𝍸 | 14 |
| 3 | 44.42-35.56 | 𝍸 𝍸 𝍸 𝍸 | 20 |
| 4 | 53.28-44.42 | /// 𝍸 | 8 |
| 5 | 62.15-53.28 | // 𝍸 | 7 |
| 6 | 71.02-62.15 | / 𝍸 | 6 |
| 7 | 79.88-71.02 | //// | 4 |

دەتوانین دەرئەنجامەکان لەگەڵ ناوەندی توێژەکان لەمیانەی ئەو خشتەیە پوخت بکرێت:-

| ناوەندی توێژەکان | دووبارە $f_i$ (ژمارەی پارچە زەوی) | توێژەکان (بڕی بەرهەمی گەنم بە تەن) | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|---|
| 22.27 | 1 | 26.70-17.83 | 1 |
| 31.13 | 14 | 35.56-26.70 | 2 |
| 39.00 | 20 | 44.42-35.56 | 3 |
| 48.86 | 8 | 53.28-44.42 | 4 |
| 57.73 | 7 | 62.15-53.28 | 5 |
| 66.59 | 6 | 71.02-62.15 | 6 |
| 75.46 | 4 | 79.88-71.02 | 7 |

لەمیانەی ئەو خشتەیەی سەرەوەدا سەرنجی ئەوە دەدەین، کە پارچە زەویەک بڕی بەرهەمی گەنمی لەنێوان 17.83تەن و کەمتر لە 26.70 تەن دایە، هەروەها 14 پارچە زەویش بڕی بەرهەمی گەنمیان لەنێوان 26.70 تەن و کەمتر لە 35.56 تەنە...هتد، بێجگە لەمانە سەرنجی ئەوە دەدرێت، کە ناوەندەکانی توێژی پارچە زەویەک نێوەنجی بەرهەمی(22.27)تەن و (14)پارچەش نێوەنجی بەرهەمیان(31.13)تەنە، بەو شێوەیە سەبارەت بە توێژەکانی ترەوە، هەروەها لە هەردوو نموونەی پێشوو سەرنجی ئەوە دەدەین، کە سەرجەمی دووبارە بوونەوەکان یەکسانە بە ژمارەی بینەرەکانی بنەڕەتی(n)، شێوازی ڕێکخستن، کەپشتی پێ بەستراوە لەدوو نموونەی پێشوو، گریمانی دۆخی یەکسانی درێژی توێژەکان دەکرێت، بەڵام دۆخی دیکەش هەیە، کە ڕەنگە درێژی توێژەکان نا یەکسان بن، ئەویش بەپێ ی سروشتی لێکۆڵینەوەو پێداویستییەکانییەوە، بۆیە ئەو شێوازە بیسوودە لەم دۆخەدا، لەبەر ئەوە پێویستی بە ژمارەی توێژ و سنوورداری هەیە، کە ئامانجی توێژینەوە دەهێنێتەدی، لەگەڵ ڕەچاو کردنی جۆری گۆڕاوی پچرپچڕ یان بەردەوام.

### 2.2.2 :-دابەشکردنی دووبارەیی ڕێژەیی : (proportionate frequency distribution)

دووبارەبوونەوە ڕێژەییەکان بریتییە لە دووبارەبوونەوەی fi، کە بە ڕێژەی سەدی گوزارشتی لێ دەکرێت، ئەمەش دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت لە ڕێگای دابەشکردنی دووبارەبوونەوەی هەر توێژێك لەسەرجەمی دووبارەیی هەمووەکی دا(n).واتە:-

$$f_i^* = \frac{f_i}{n}.100 \qquad \cdots \quad (2.6)$$

**نموونە :(3.2)**:- دابەشکردنی دووبارەیی ڕێژەیی بۆ نموونەی پێشوو بدۆزەرەوە(2.2):

**شیکار:**- دەتوانرێت دابەشکردنی دووبارەیی ڕێژەیی بە دەست بهێنرێت لە ڕێگای دابەشکردنی دووبارەیی هەر توێژێك لەسەر سەرجەمی دووبارەیی هەمووەکی(60) واتە:-

$$f_i^* = \frac{f_i}{n}.100$$

$$f_1^* = \frac{f_1}{n}.100 = \frac{1}{60}.100 = 1.667$$

$$f_2^* = \frac{f_2}{n}.100 = \frac{14}{60}.100 = 23.333$$

$$f_7^* = \frac{f_7}{n}.100 = \frac{4}{60}.100 = 6.667$$

دەتوانرێت لە میانەی ئەم خشتەیە پوخت بکرێتەوە:-

| $f_i^*$ دووبارەی ڕێژەیی (ژمارەی پارچە زەوییەکان) | $f_i$ دووبارە (ژمارەی پارچە زەوییەکان) | توێژەکان( بڕی بەرهەمی گەنم بە تەن) |
|---|---|---|
| 1.667 | 1 | 26.70-17.83 |
| 23.333 | 14 | 35.56-26.70 |
| 33.333 | 20 | 44.42-35.56 |
| 13.334 | 8 | 53.28-44.42 |
| 11.667 | 7 | 62.15-53.28 |
| 10 | 6 | 71.02-62.15 |
| 6.667 | 4 | 79.88-71.02 |
| 100 | 60 | سەرجەم |

ئەمــەش مانــەی ئەوەیــە، کــە1.667%ی پارچــە زەوییــەکان بەرهــەمییان لــە نێــوان 17.83تەن بۆ کەمتر لە23.333% پارچە زەوییەکان بەرهـەمییان لـە نێـوان 26.70 تـەن بـۆ کـەمتر لـە 35.56 تەنـە، بـەم شـێوەیە سـەبارەت بـەوانی تـر... بـۆ زانینـیش سەرجەمی دووبارەیی ڕێژەیی پێویستە بە (100)یەکسان بێت .

**3.2.2 :- دابەشکردنی دووبـارەیی کـۆ کراوەیـی Cumulative Frequency (Distribution):**

بریتییە لەو دابەش بوونەی، کە بڕی دووبارەیی کـۆکراوەیی لـە بەهایـەکی دیـاریکراو لـە بەهاکانی بینەران دەکات، ئەمەش بریتییە لە دوو جۆر:

**یەکەم:- دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەیی بەرز بـۆوە:-** ئەمـەش کەڵەکـە بـوونی دووبارەیی ڕوون دەکاتەوە هەر لـە توێـژی یەکـەمی خشـتەکە تـا دوا توێژەکـەی، ئەمـەو دووبارەیی کۆکراوە لە سەر بنچینەی سنووری بەرزی توێژەکان دیاری دەکات.واتە:

$$F_1 = f_1$$

$$F_2 = f_1 + f_2$$

$$\vdots$$

$$F_m = f_1 + f_2 + \cdots + f_m \qquad \cdots \quad (2.7)$$

دەتوانرێت دابەش کردنی دووبـارەیی کـۆکراوەیی بـەرزبۆو fl بگۆڕدرێـت بـۆ دابـەش کردنی دووبارەیی بەرزبۆوەی ڕێژەیی flئەویش بەپێ ی ئەم دەقەی خوارەوە:-

$$F_i^* = \frac{F_i}{n}.100 \qquad \cdots \quad (2.8)$$

**نموونە 4.2:** بە پشت بەستن بە نموونە1.2 دابەش کردنی دووبارەیی کۆکراوەیی بەرزبۆوەی ڕێژەیی بدۆزەوە:

| دووبارە $f_i$ (ژمارەی کرێکار) | توێژەکان (کرێ) | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|
| 5 | 29-26 | 1 |
| 12 | 33-30 | 2 |
| 11 | 37-34 | 3 |
| 9 | 41-38 | 4 |
| 5 | 45-42 | 5 |
| 3 | 49-46 | 6 |

**شیکار :-** لە میانەی نموونەی 1.2 ئەم خشتەی خوارەوەمان هەیە دابەش کردنی دووبارەیی کۆکراوەی بەرز بۆوە هەیە، ئەویش بەم شێوەیەی:-

$$F_1 = f_1 = 5$$

$$F_2 = f_1 + f_2 = 5 + 12 = 17$$

$$\vdots$$

$$F_m = f_1 + f_2 + \cdots + f_m = 5 + 12 + \cdots + 3 = 45$$

بەدابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەیی بەرز بۆوەی ڕێژەیی بەم شێوەیە دەبێت:-

$$F_i^* = \frac{F_i}{n}.100$$

$$F_1^* = \frac{F_1}{n}.100 = \frac{5}{45}.100 = 11.111$$

$$F_2^* = \frac{F_2}{n}.100 = \frac{17}{45}.100 = 37.778$$

$$\vdots$$

$$F_6^* = \frac{F_6}{n}.100 = \frac{45}{45}.100 = 100$$

| زنجیرەی توێژ | توێژەکانی(کرێ) | دووبارەیی (ژمارەی کرێکار | دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە | دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوەی ڕێژەیی |
|---|---|---|---|---|
| 1 | 29-26 | 5 | 5 | 11.111 |
| 2 | 33-30 | 12 | 17 | 37.778 |
| 3 | 37-34 | 11 | 28 | 62.222 |
| 4 | 41-38 | 9 | 37 | 82.222 |
| 5 | 45-42 | 5 | 42 | 93.333 |
| 6 | 49-46 | 3 | 45 | 100 |

ئەمەش مانەی ئەوەیە، کە ژمارەی ئەو کرێکارانەی کرێیان لە(37)هەزار کەمترە بریتییە لە(28) کرێکار، و ئەو کریکانەی کرێیان لە(45) هەزار دینار کەمترە ژمارەییان (42)کرێکارە، هەروەها ڕێژەی ئەو کرێکارانەی کرێیان لە (37) هەزار دینار کەمترە بریتییە لە (62.222٪)، ژمارەی ئەو کرێکارانەی کری یان لە (45) هەزار دینار کەمترە بریتییەلە(333 . 93٪).

**تێبینی:-** ئەگەر بێتو داتاکان لە جۆری پچڕپچڕ بێت (هەروەکو نموونەی سەرەوە)، ئەوا دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوەو ڕێژەیی یەکسانە یان کەمترە لە بەرزترین ڕادەی توێژەکە، لە هەمان کاتدا ئەگەر بێتو داتاکان لە جۆری بەردەوام بن، دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە و ڕێژەیی کەمترە لە بەرزترین ڕادەی توێژەکە.

**دووەم:- دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوە:** ئەمەش کە میوونەوەی دووبارەیی ڕوون دەکاتەوە، کەلەتوێژی یەکەمی خشتەکە دەست پێ دەکات و بە دوا توێژی کۆتایی پێ دێت، هەژمارکردنی دووبارەیی کۆکراوەیی لەسەر بنچینەی سنووری نزمی توێژەکان دەبێت.واتە:-

$$F_1' = \mathrm{n}$$

$$F_2' = \mathrm{n} - f_1$$

$$\vdots$$

$$F_{\mathrm{m}}' = \mathrm{n} - f_1 - f_2 - \cdots - f_{\mathrm{m-1}} = f_{\mathrm{m}} \qquad \cdots \quad (2.9)$$

دەتوانرێت دابەشکردنی کۆکراوەی نزم بۆوەی fI بگۆردرێت بۆ دابەشکردنی کۆکراوەی نزم بۆوەی ڕێژەیی fI ئەویش لە میانەی ئەم دەقەی خوارەوە:-

$$F_i'^* = \frac{F_i'}{n}.100 \qquad \cdots \quad (2.10)$$

**نموونه**( 5.2 ): به پشت بەستن به نموونـه (1.2) دابەشـکردنی دووبـارەیی کـۆکراوەی نزم بۆوەو ڕێژەیی بدۆزەرەوە؟

| ناوەندی تویژەکان | دووباره $f_i$ (ژمارەی کرێکار) | تویژەکان (اکرێ) | زنجیرەی تویژ |
|---|---|---|---|
| 27.5 | 5 | 29-26 | 1 |
| 31.5 | 12 | 33-30 | 2 |
| 35.5 | 11 | 37-34 | 3 |
| 39.5 | 9 | 41-38 | 4 |
| 43.5 | 5 | 45-42 | 5 |
| 47.5 | 3 | 49-46 | 6 |

**شیکار:** دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوە، دەتوانرێت بە دەست بهێنرێت لـە میانەی ئەمانەی خوارەوە:

$$F_1' = n = 45$$

$$F_2' = n - f_1 = 45 - 5 = 40$$

$$\vdots$$

$$F_m' = n - f_1 - f_2 - \cdots - f_{m-1} = 45 - 5 - 12 - \cdots - 5 = 3 = f_m$$

دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوەی ڕێژەیی، دەتوانرێت بە دەست بهێنرێت لـە میانەی ئەمانەی خوارەوە:

$$F_i'^* = \frac{F_i'}{n}.100$$

$$F_1'^* = \frac{F_1'}{n}.100 = \frac{45}{45}.100 = 100$$

$$F_2'^* = \frac{F_2'}{n}.100 = \frac{40}{45}.100 = 88.889$$

$$\vdots$$

$$F_6'^* = \frac{F_6'}{n}.100 = \frac{3}{45}.100 = 6.667$$

دەتوانرێت لە میانەی ئەم خشتەیە پوخت بکرێتە وە:—

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان (کرێ) | دووبارە $f_i$ (ژمارەی کرێکاران) | دووبارەی کۆکراوەیی نزمبۆوە $F'_i$ | دووباری کۆکراوەیی نزمبۆوەی ڕێژەیی $F'^{*}_i\%$ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | 29-26 | 5 | 45 | 100 |
| 2 | 33-30 | 12 | 40 | 88.889 |
| 3 | 37-34 | 11 | 28 | 62.222 |
| 4 | 41-38 | 9 | 17 | 37.778 |
| 5 | 45-42 | 5 | 8 | 17.778 |
| 6 | 49-46 | 3 | 3 | 6.667 |

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ژمارەی ئەو کرێکارانەی کرێی هەفتانەیان(34) هەزار دینار بە سەرەوەیە بریتییە لە (28) کرێکار، هەروەها ژمارەی ئەو کرێکارانەی کرێ ی هەفتانەیان (42) هەزار دینار بەسەرەوەیە بریتییە لە(8)کرێکار، ڕێژەی ئەو کرێکارانەی (34) هەزار دینار بە سەرەوەییان هەیە بریتییە لە(62،222٪) وڕێژەی ئەو کرێکارانەی کرێ بیان لە (42) هەزار دینارە بەسەرەوەیە بریتییە لە(17.778٪ )، هەروەها دەتوانرێت دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەیی بەرزبۆوەو نزم بۆوە لەدۆخی گۆڕاوە جۆرەکان دروست بکرێت، ئەویش لەمیانەی کۆکردنەوە یان کەمکردنەوەی دووبارەبوونەوەکان بەپێ ی ئاستەکانی ئەو گۆڕاوە، هەر وەکو لەمیانەی ئەم نموونەییە روون کراوەتەوە:

**نموونە**( 6.2 ): ئەمەش بژاردەیەکی ڕەمەکییە و لە(50)کەس بەپێ ی ئاستی زانستی پێك هاتووە: داواکاری خشتەی دابەشکردنی دووبارەیی بەرزبۆوەو نزم بۆوە دروست بکە؟

| ئاستی زانستی | ژمارەی کەسەکان |
|---|---|
| دەخوێنێت و دەنووسێت | 7 |
| سەرەتایی | 11 |
| ناوەندی | 15 |
| ئامادەیی | 9 |
| کۆلێژ | 8 |

**شیکار:** کۆکردنـەوەی دووبـارەیی لەئاسـتی یەکـەم بەخوێندنـەوەو نوسـین دەسـت پێدەکات:-

| ئاستی زانستی | ژمارەی کەسەکان $f_i$ | شێوازی کۆکردنەوە | $F$ | شێوازی کەمکردنەوە | $F'$ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەخوێنێت و دەنووسێت | 7 | دەخوێنێت و دەنووسێت | 7 | هەموو ئاستەکان | 50 |
| سەرەتایی | 11 | دەخوێنێت و دەنووسێت سەرەتایی | 18 | کۆلیژ و ئامادەیی و ناوەندی و سەرەتایی | 43 |
| ناوەندی | 15 | دەخوێنێت و دەنووسێت وسەرەتایی و ناوەندی | 33 | کۆلیژ و ئامادەیی و ناوەندی | 32 |
| ئامادەیی | 9 | دەخوێنێت و دەنووسێت وسەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی | 42 | کۆلیژ و ئامادەیی | 17 |
| کۆلیژ | 8 | هەموو ئاستەکان | 50 | کۆلیژ | 8 |

## 3-2: خستنەرووی هێلکاری داتاکان:

ئامرازەکانی خستنە رووی هێلکاری (شێوەو وێنەی هێلکاری) ئەمەش دەکەوێتە نێو ئامرازەکـانی ئامـاریی باسـەنی، ئەمـەش بـۆ ڕێکخسـتن و پوختـەکردن و خسـتنە ڕووی داتاکانەوەیـە، ئەمـەش بـەدیلی خشـتەی دووبـارەیی دەگەیـەنێت، یـان تـەواوکاری، ئـەم ئامرازانەش بەئاسان و کاریگەر لەخستنە ڕووی داتاکـان دادەنرێـت، و پێـدانی وێنەیـەکی ڕوون و ئاشکرا (بیرۆکەیەکی خێرا) لەو ئامرازانەی کەبەکارهێنراوە:

### یەکەم: لەدۆخی بوونی داتاکانی ڕیزکراودا:

### 1- پلیکانی دووبارەیی: ( Histogram )

بریتییە لەنوێنەربونی داتاکان بەبەکارهێنانی کۆمەڵێك لاکێشەی پێکەوە لکـاو لـەدۆخی داتا بەردەوامەکاندا و لاکێشەی پێکەوە نەلکاو لەدۆخی داتا پچرپچرەکان دایە، بەجۆرێك ڕێسای هەریەکە یـان یەکسـان دەبێـت بەدرێـژی توێـژەکان و بەرزیشـی یەکسـان دەبێـت بەدووبارەییەکانی (یان دووبارەیی ڕێـژەیی) ئەمـەش ئاسـانترین ڕێگایـە بـۆ نوێنەرایـەتی کردنـی دابەشـکردنی دووبـارەیی و ڕووبەرەکـەی بەشـێوەیەك هـاوکۆك بێـت، لەگـەڵ

دووبارەیی هەمووەکی بۆ دابەشکردن، بەجۆرێك سەرجەمی رووبەری لاکێشەکان یەکسان بێت، بەسەرجەمی هەمووەکی دووبارەییەکان.

**نموونە** :( 7-2 ) بەکارهێنانی پلیکانی دووبارەیی بۆ نوینەرایەتی کردنی داتا ڕیزکراوەکان لە نموونەی(2–1):

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان( کرێ) | دووبارە $f_i$ ( ژمارەی کرێکاران ) |
|---|---|---|
| 1 | 29-26 | 5 |
| 2 | 33-30 | 12 |
| 3 | 37-34 | 11 |
| 4 | 41-38 | 9 |
| 5 | 45-42 | 5 |
| 6 | 49-46 | 3 |

**شیکار:**- بەهۆی ئەوەی داتاکان لە جۆری پچڕ پچڕن، بۆیە پلیکانە دووبارەیی لەلاکیشەی نەلکێنراو پێك دێت هەروەکو لەم شێوە هێلکاریەیی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە :




**شێوەی( 1.2 ) پلیکانی دووبارەیی بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

**نموونە : ( 2_8 ):** بەکارهێنانی پلیکانی دووبارەیی کە نوێنەرایەتی داتاکانی ڕیزکراو لەنموونەی (2_2)دەکات :

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان ( بڕی بەرهەمی گەنم بە تەن ) | دووبارە $f_i$ ( ژمارەی پارچە زەوییەکان ) | ناوەندی توێژەکان |
|---|---|---|---|
| 1 | 26.70-17.83 | 1 | 22.27 |
| 2 | 35.56-26.70 | 14 | 31.13 |
| 3 | 44.42-35.56 | 20 | 39.00 |
| 4 | 53.28-44.42 | 8 | 48.86 |
| 5 | 62.15-53.28 | 7 | 57.73 |
| 6 | 71.02-62.15 | 6 | 66.59 |
| 7 | 79.88-71.02 | 4 | 75.46 |

**شیکار:** بەهۆی ئەوەی داتاکان لە جۆری بەردەوامن، بۆیە پلیکانی دووبارەیی لەلاکێشەی پێکەوەلکاو پێك دێت هەروەکو لەم هێلکارییە ڕوون کراووەتەوە :




**شێوەی( 2.2 ) پلیکانی دووبارەیی بۆ 60 پارچە زەوی بە پێی بەرهەمی گەنم**

**تێبینی:** هەندێك جار هەیە توێژەکانی دابەشکردن لە درێژی نایەکسانن، بۆیە پێویستی بەئەنجامدانی دەستکاری دووبارەبوونەکان هەیە، ئەویش لەمیانەی دابەشکردنی دووبارەیی بنەڕەتی لەسەر درێژی توێژ دەبێت، تا تێکرای دووبارەیی بەدەست بهێنین .

## 2 ) زنجیرە هێڵە ڕاستی دووبارەیی ( Frequency Polygon)

بریتییە لەشێوەی هێلکاری بە بەکارهێنانی زنجیرە هێڵە راستی دووبارەیی، کە خاڵی تونژەکان بەیەك دەگەیەنێت لەبەرامبەر دووبارەبونەوەکان ڕێژەیی، ئەویش لە میانەی ناوەندی توێژەکان، کە نوێنەرایەتی تەوەرەی ئاسۆیی و دیاریکردنی خاڵەکان دەکات، کە لەبەرامبەرەکەی ناوەندی هەر توێژێك لەتەوەرەی ستوونی، ئینجا دوای ئەوە هێڵە ڕاستەکان لەنێوان خاڵەکان بەیەك دەگەیەنێت، دەتوانرێت هێڵکاری زنجیرە هێڵی راستی دووبارەیی لەمیانەی پلیکانی دووبارەیی بکێشرێت، ئەویش لە ڕێگای پۆلین کردنی ڕێسا بەرزەکانی لاکێشەکانی پلیکانی دووبارەیی ئەنجام بدرێت، دوای ئەوەی خاڵەکان بە هێڵی راست بەیەك دەگەیەنرێت، بەمەش زنجیرە هێڵی راستی دووبارەیی دێتە دەست، هەروەکو لەم نموونەیە روون کراوەتەوە.

**نموونە**(9.2): بەپشت بەستن بەنموونەی (1.2) هێڵکاری زنجیرە هێڵی راستی دووبارەیی بکێشە:

| سەنتەری توێژەکان | دووبارەکان $f_i$ (ژمارەی کرێکاران) | توێژەکان (کرێ) | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|---|
| 27.5 | 5 | 29-26 | 1 |
| 31.5 | 12 | 33-30 | 2 |
| 35.5 | 11 | 37-34 | 3 |
| 39.5 | 9 | 41-38 | 4 |
| 43.5 | 5 | 45-42 | 5 |
| 47.5 | 3 | 49-46 | 6 |




**شێوەی( 3.2 ) زنجیرە ڕاستە هێڵی دووبارەیی بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

هەروەها دەتوانرێت زنجیرە هێڵی راستی دووبارەیی لەنموونەی پێشوو لەسەر شێوەی رووبەر بخرێتەروو ،کە نوێنەرایەتی قەبارەی دووبارەبوونەکان بەم شێوەیە دەکات :



**شـێوەی( 4.2 ) زنجـیرە ڕاسـتە هێڵـی دووبارەیی( لـە سـەر شـێوەی ڕووبـەر) بـۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

## 3-چەماوەی دووبارەیی :

ئەمەش ڕێگایەکی هاوشێوەی هێلکاری زنجیرە هێڵی راستی دووبارەییە، بەڵام لێرەدا لەجیاتی ئەوەی خاڵەکان بەهێڵی راست بگەیەنین، دەبێ چەماوەی بەردەوام بەهەموو خاڵەکان تێپەڕبێت، ئەمەش لەداتا بەردەوامەکان بەکاردەهێنرێت، لێرەدا چەماوەی دووبارەیی لەمیانەی ئەم خشتەیەڕوون بکەینەوە :

**نموونە :**( 10.2 ) بەپشت بەستن بەنموونەی (2.2)چەماوەی دووبارەیی بکێشە :

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان ( بڕی بەرهەمی گەنم بە تەن ) | $f_i$ دووبارەکان ( ژمارەی پارچە زەوی ) | سەنتەرەکانی توێژ |
| --- | --- | --- | --- |
| 1 | 26.70-17.83 | 1 | 22.27 |
| 2 | 35.56-26.70 | 14 | 31.13 |
| 3 | 44.42-35.56 | 20 | 39.00 |
| 4 | 53.28-44.42 | 8 | 48.86 |
| 5 | 62.15-53.28 | 7 | 57.73 |
| 6 | 71.02-62.15 | 6 | 66.59 |
| 7 | 79.88-71.02 | 4 | 75.46 |

**شیکار:** دەتوانرێت چەماوەی دووبارەیی بۆ داتا بەردەوامەکان بەم شێوەیە بکێشرێت :




**شێوەی( 5.2 ) چەماوەی دووبارەیی بۆ 60 پارچە زەوی بە پێی بەرهەمی گەنم**

## 4- چەماوەی دووبارەیی کۆکراوە:

بەمەبەستی کێشانی چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە، ئەوا پێویستە یەکەمجار خشتەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە دروست بکەین، ئینجا خاڵەکان لەسەر تەوەرەی ئاسۆیی بەسنووری توێژی بەرز دیار بکەین، بەڵام خاڵەکانی سەر تەوەرەی ستوونی بە دووبارەیی کۆکراوەی بەرز بۆوە (یان دووبارەیی بەرزبۆوەی ڕێژەیی ) دیاردەکرێت .

**نموونە** ( 11.2 ) : بەپشت بەستن بەنموونەی (1.2) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە یان ڕێژەی دروست بکە:

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان (کرێ) | $f_i$ دووبارەکان (ژمارەی کرێکاران) | دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە $F_i$ | دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوەی ڕێژەیی $F_i^*\%$ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | 29-26 | 5 | 5 | 11.111 |
| 2 | 33-30 | 12 | 17 | 37.778 |
| 3 | 37-34 | 11 | 28 | 62.222 |
| 4 | 41-38 | 9 | 37 | 82.222 |
| 5 | 45-42 | 5 | 42 | 93.333 |
| 6 | 49-46 | 3 | 45 | 100 |

**شیکار** : سنووری بەرزی توێژەکانمان هەیە، کە بریتییە لەتەوەرەی ئاسۆیی و لە بەرامبەر دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە، کە نوێنەرایەتی تەوەرەی ستونی دەکات، واتا:

| زنجیرەی توێژ | سنووری بەرزی توێژەکان | $F_i$ دووبارەی کۆکراوەی بەرزبۆوەی |
|---|---|---|
| 1 | 29 | 5 |
| 2 | 33 | 17 |
| 3 | 37 | 28 |
| 4 | 41 | 37 |
| 5 | 45 | 42 |
| 6 | 49 | 45 |

واباشە چەماوە دابخرێت ،سەرباری نزمترین رادەی توێژی یەکەم لە بەرامبەر سفر ئەم شێوەی خوارەوە چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە نیشان دەدات:




**شێوەی( 6.2 ) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

بەهەمان ڕێگای سەرەوە دەتوانین چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوەی ڕێژەیی دروست بکەین، هەروەکو لەم شێوەیە ڕوون دەبێتەوە :

| $F_i^*\%$ دووبارەی کۆکراوەی بەرزبۆوەی ڕێژەیی | سنووری بەرزی توێژەکان | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|
| 11.111 | 29 | 1 |
| 37.778 | 33 | 2 |
| 62.222 | 37 | 3 |
| 82.222 | 41 | 4 |
| 93.333 | 45 | 5 |
| 100 | 49 | 6 |




**شێوەی( 7.2 ) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوەی ڕێژەیی بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

بۆ مەبەستی نوێنەرایەتی کردنی چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوەو ڕێژەیی، سنووری نزمترین توێژەکان دیاردەکرێت، دوای ئەوە خاڵەکان دیاردەکرێت کە بریتییە لە (سنووری نزمی توێژەکان، دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوە)، وا باشیشە ئەو چەماوەیە دابخرێت، سەرباری بەرزترین رادەی دوا توێژ لە بەرامبەر سفر، ئەم نموونەیەش ئەمە ڕوون دەکاتەوە:

**نموونە (12.2):** بە پشت بەستن بەنموونەی (1.2) چەماوەی دووبارەیی نزم بۆوەو ڕێژەیی بکێشە واتە بۆ خشتەی دووبارەیی خوارەوە:

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان (کرێ) | دووبارە $f_i$ (ژمارەی کرێکاران) | دووبارەی کۆکراوەی نزمبۆوەی $F_i'$ | دووبارەی کۆکراوەی نزمبۆوەی ڕێژەیی $F_i'^{*}\%$ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | 29-26 | 5 | 45 | 100 |
| 2 | 33-30 | 12 | 40 | 88.889 |
| 3 | 37-34 | 11 | 28 | 62.222 |
| 4 | 41-38 | 9 | 17 | 37.778 |
| 5 | 45-42 | 5 | 8 | 17.778 |
| 6 | 49-46 | 3 | 3 | 6.667 |

**شیکار :** یەکەمجار سنووری نزمی توێژەکان دیاربکە، لەگەڵ بەرزترین ڕادەی توێژی کۆتایی بەرامبەر دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوە واتە :

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان (کرێ) | دووبارەی کۆکراوەی نزمبۆوە $F_i'$ |
|---|---|---|
| 1 | 26 | 45 |
| 2 | 30 | 40 |
| 3 | 34 | 28 |
| 4 | 38 | 17 |
| 5 | 42 | 8 |
| 6 | 49-46 | 3 |

ئەم شێوەی خوارەوە چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوە ڕوون دەکاتەوە :




**شێوەی( 8.2 ) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی نزمبۆوە بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

بۆ کێشانی چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوەی ڕێژەیی، پێویستە سنوری نزمی توێژەکان دیاربکرێت، لەگەڵ دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوەی ڕێژەیی ،واتە :

| $F_i'^{*}\%$ دووبارەی کۆکراوەی نزمبۆوەی ڕێژەیی | توێژەکان ( کرێ ) | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|
| 100 | 26 | 1 |
| 88.889 | 30 | 2 |
| 62.222 | 34 | 3 |
| 37.778 | 38 | 4 |
| 17.778 | 42 | 5 |
| 6.667 | 49-46 | 6 |

ئەم شێوەی خوارەوە ئەمە ڕوون دەکاتەوە:




**شێوەی( 9.2 ) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی نزمبۆوەی ڕێژەیی بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

**تێبینی :** هەندێك جار وا پێویست دەكات كێشانی چەماوەی دووبارەیی كۆكراوەی بەرز بۆوەو نزم بۆوە بەرامبەر ناوەندی توێژەكان لەیەك شێوەدا هەروەكو لەم شێوەیەدا بەدیار دەكەوێت، ئەویش بەپشت بەستن بەداتاكانی نموونەی (1.2):




**شێوەی( 10.2 ) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە و نزمبۆوە بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێی ڕۆژانە**

**دووەم : لە دۆخی داتا ناڕیزکراوەکان :** دۆخی داتا نا ڕیزکراوەکان بریتییە لە :

## 1_ ستوونە هێڵکارییەکان :

ئەمەش لە خستنەرووی داتا جیاجیاکان بەکاردەهێنرێت بەهەمان شێوە لە داتا باسە نییەکانیش بەکاردەهێنرێت ،(Bar charts)

بۆ ئەمەش ژمارەیەك شێوەی جیاجیای هەیە، لەوانە :

## أ_ ستوونی هێڵکاری سادە :

ئەمەش لەنوێنەرایەتی کردنی بەهای داتاکانی تاکە دیاردەیەکی لێکۆڵینەوە بەکار دەهێنرێت، جاری وا هەیە ئەو داتایانە دابەشکراوە لە بەرامبەر کات (زنجیرەی زەمەن )، یان زنجیرەی یەکەکانی بەرهەم ....هتد.

**نموونە**( 2. 13 ) : ستوونی هێڵکاری بۆ نوێنەرایەتی کردنی ژمارەی قوتابیە وەرگیراوەکان لە بەشی ئابووری لە ماوەی (10) ساڵ بەکاربهێنە.

| سال | 2002 | 2003 | 2004 | 2005 | 2006 | 2007 | 2008 | 2009 | 2010 | 2011 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی قوتابیان | 50 | 60 | 70 | 65 | 75 | 90 | 120 | 130 | 150 | 140 |

**شیکار** :- دەتوانرێت ستوونی هێڵکاری لە نوێنەرایەتی داتاکانی ئەو خشتەیە بەکار بهێنرێت، ئەویش

لەمیانەی گریمانی ئەوەی ساڵ بریتییە لە تەوەرەی ئاسۆیی و لە بەرامبەردا ژمارەی قوتابیانی وەرگیراو لە بەشی ئابووری بریتییە لە تەوەرەی ستوونی کە لەم شێوە بەیانییە ڕوون کراوەتەوە:




**شێوەی( 11.2 ) ستوونی بەیانی بۆ ژمارەی قوتابیانی وەرگیراو لە بەشی ئابووری لە نێوان ماوەی( 2011-2002 )**

**نموونـە :-( 14.2 ):-** سـتوونی هێلکـاری لەنوێنەرایـەتی کردنـی ئاسـتی زانسـتی بـۆ داتاکان نموونە (6.2) بەکاربهێنە :-

| ژمارەی کەسەکان | ئاستی زانستی |
|---|---|
| 7 | خوێندنەوە و نووسین |
| 11 | سەرەتایی |
| 15 | ناوەندی |
| 9 | ئامادەیی |
| 8 | کۆلیژ |

**شیکار :-** ئاستی زانستی بریتییە لە تەوەرەی ئاسۆیی لەبەرامبەر ئەوەدا ژمارەی کەسەکانی لێکۆڵینەوەکە دەکەوێتە تەوەرەی ستوونی، هەروەکو لەم شێوەیەدا ڕوون کراوەتەوە :-




**شێوەی( 12.2 ) ستوونی بەیانی بۆ ژمارەی کەسەکان بە پێی ئاستی خوێندن**

## ب- ستونی هێڵکاری ئاوێتەیی :-

بۆ نوێنەرایەتی بەهای داتای زیاتر لە دیاردەیەکی لێکۆڵینەوە (دوو دیاردە یان زیاتر) بەکار دەهێنرێت.

**نموونە :-**( 15.2 ) ستوونی هێڵکاری ئاوێتەیی بەکاربهێنە، بۆ نوێنەرایەتی کردنی ژمارەی قوتابیانی وەرگیراو لە بەشی ئابووری کە پۆلین کراوە بە پێی نێرو مێ لە ماوەی (2002-2011 ) هەروەکو لەم خشتەیە بە دیاردەکەوێت :-

| سال | 2002 | 2003 | 2004 | 2005 | 2006 | 2007 | 2008 | 2009 | 2010 | 2011 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نێر | 30 | 40 | 45 | 35 | 35 | 50 | 70 | 75 | 70 | 80 |
| مێ | 20 | 20 | 25 | 30 | 40 | 40 | 50 | 55 | 80 | 70 |

**شیکار :-** بۆ کێشانی ستوونی هێڵکاری ئاوێتەیی دەتوانین تەوەرەی ئاسۆیی بریتی بێت لە ساڵەکان، لەهەمان کاتدا تەوەرەی ستوونی بریتییە لە ژمارەی قوتابیانی کوڕو کچ، هەروەکو لەم شێوەیە بەدیاردەکەوێت :-




**شێوەی( 13.2 ) ستوونی بەیانی ئاوێتەیی بۆ ژمارەی قوتابیانی وەرگیراو لە بەشی ئابووری بە پێی ڕەگەز لە نێوان ساڵانی( 2011-2002 )**

دەتوانرێت نوێنەرایەتی داتاکان لەشێوەی ستوونەکان دابەش بکرێت بۆ نێرو مێ، هەروەکو لەم شێوەیە ڕوون کراوەتەوە :-




**شێوەی( 14.2 ) ستوونی بەیانی ئاوێتەیی( بەشکراو ) بۆ ژمارەی قوتابیانی وەرگیراو لە بەشی ئابووری بە پێی ڕەگەز لە نێوان ساڵانی( 2002-2011 )**

## 2- هێڵکاری بازنەیی :-

ئەمەش لە داتا باسەنییەکان بە کاردەهێنرێت وەك (جۆری کەرتە ئابوورییەکان، دابەش کردنی دانیشتوان، جۆرەکانی کاڵای بەکاربردن ...هتد)، کە بازنەکە بۆ چەند بەشێك دابەش دەکات و ژمارەی یەکسان دەبێت بەکەرتەکانەوە، کە لە ناوبازنەکە نوێنەرایەتی دەکات، بەجۆرێك سەرجەمی ڕووبەری کەرتەکان بریتی دەبێت لەڕووبەری بازنەکە، بەئامانجی دیاریکردنی قەبارەی هەریەك لەو کەرتانە، بۆیە پێویستە گۆشەی هەریەك لەوانە دیار بکرێت، واتە گۆشەی هەر کەرتێك لەو کەرتانە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :-

$$\theta_i = \frac{A_i}{T} \times 360^\circ \qquad \cdots \quad (2.12)$$

**نموونە :-( 16.2 ):-** یەکێك لە توێژینەوە ئابوورییەکان باسی لە خەرجی خێزانی مانگانە دەکات، کە بریتییە لە بڕی (900) هەزار دینار، و بەم شێوەی خوارەوە دابەشکراوە:- خۆراك (300)، جل وبەرگ (200)، شوێنی نیشتەجێ بوون (250)کارەبا(100)، جۆراوجۆر(50).

**داواکاری :-** هێڵکاری بازنەیی بکێشە کە نوێنەرایەتی ئەم داتایانەی سەرەوە بکات :

**شیکار :-** بەبەکارهێنانی دەقی (2.12) دەتوانین هەموو گۆشەی جۆرەکانی خەرجی بە دەست بهێنین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:- ئینجا بەپشت بەستن بەگۆشە هەژمارکروەکان دەتوانین ئەم بازنەیە بەم شێوەیە بکێشین:-

$$\theta_i = \frac{A_i}{T} \times 360^\circ$$

$$\theta_1 = \frac{A_1}{T} \times 360^\circ = \frac{300}{900} \times 360^\circ = 120^\circ$$ خۆراك

$$\theta_2 = \frac{A_2}{T} \times 360^\circ = \frac{200}{900} \times 360^\circ = 80^\circ$$ جلوبەرگ

$$\theta_3 = \frac{A_3}{T} \times 360^\circ = \frac{250}{900} \times 360^\circ = 100^\circ$$ شوێنی نیشتەجێبوون

$$\theta_4 = \frac{A_4}{T} \times 360^\circ = \frac{100}{900} \times 360^\circ = 40^\circ$$ کارەبا

$$\theta_5 = \frac{A_5}{T} \times 360^\circ = \frac{50}{900} \times 360^\circ = 20^\circ$$ هەمەجۆر




**شێوەی( 15.2 ): بازنەی بەیانی بۆ خەرجی مانگانەی خێزانەکانی هەرێمی کوردستان**

**3- هێڵی بەیانی :-** دەتوانرێت نوێنەرایەتی دیاردەیەك یان ژمارەیەك دیاردەی لێکۆڵینەوە بکات، ئەویش لەمیانەی ماوەی زەمەنی بەشێوەی هێڵی بەیانی دەبێت، هەروەکو لەم نموونەی خوارەوە ڕوون دەبێتەوە:-

**نموونە (17.2):-** ئەم خشتەی خوارەوە نوێنەرایەتی خەرجی گریمانی بۆ شارەوانییەکانی هەرێمی کوردستان لەماوەی (10)ساڵ دەکات .

| ساڵ | 2002 | 2003 | 2004 | 2005 | 2006 | 2007 | 2008 | 2009 | 2010 | 2011 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | 200 | 500 | 450 | 550 | 750 | 800 | 840 | 920 | 960 | 990 |
| سلێمانی | 150 | 400 | 300 | 450 | 610 | 650 | 550 | 800 | 760 | 830 |
| دهۆك | 100 | 350 | 400 | 410 | 500 | 600 | 400 | 600 | 670 | 750 |

**داواکاری :**-هێڵی بەیانی بکێشە، کە نوێنەرایەتی خەرجی گریمانی شارەوانییەکانی هەرێمی کوردستان بۆ ماوەی (10) ساڵ بکات .

**شێکار :**- دەتوانرێت هێڵی بەیانی بۆ خەرجی گریمانی بۆ شارەوانییەکانی هەرێمی کوردستان بکێشرێت کە تەوەرەی ستوونی بریتییە لەخەرجییەکان و تەوەرەی ئاسۆیشی بریتییە لەساڵەکان، کە بەم شێوەیە کێشراوە:-




**شێوەی( 16.2 ): هێڵی بەیانی بۆ خەرجی مانگانەی خێزان لە هەرێمی کوردستان**

## ڕاهێنانی بەشی دووەم

**1-2 :** لێکۆڵینەوە لە کێشی (50) قوتابی دەکات، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 27 | 43 | 33 | 37 | 35 | 24 | 23 | 36 | 37 | 19 |
| 43 | 24 | 23 | 42 | 37 | 33 | 24 | 27 | 43 | 18 |
| 19 | 33 | 28 | 45 | 23 | 22 | 34 | 30 | 32 | 23 |
| 42 | 22 | 31 | 33 | 34 | 44 | 31 | 31 | 41 | 34 |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 32 | 19 | 35 | 45 | 29 | 45 | 32 | 22 | 34 | 33 |

**داواکاری:-** ئەم داتایانە لە خشتەیەکی دووبارەیی ڕێك بخەو ناوەندی تویژ دەربهێنە

**2-2:** ئەم داتایانەی خوارەوەمان هەبێت :

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 12.7 | 5.8 | 4.3 | 13.7 | 8.5 | 9.1 | 7.2 | 3.8 | 3.5 | 3.9 |
| 6.4 | 2.4 | 2.3 | 4.2 | 3.7 | 3.3 | 2.3 | 9.7 | 4.3 | 5.8 |
| 3.9 | 3.3 | 2.8 | 4.5 | 2.3 | 5.2 | 3.1 | 3.0 | 3.2 | 6.3 |
| 4.2 | 5.2 | 3.1 | 3.3 | 5.4 | 4.4 | 3.9 | 3.1 | 4.7 | 8.4 |

**داواکاری بریتییە لە:**

1- خشتەی دابەشکردنی دووبارەیی

2- دووبارەبوونی کۆکراوەی بەرز بوونەوە

3- دووبارەبوونی کۆکراوەی بەرز بوونەوەی ڕێژەیی

4- دووبارەبوونەوەی کۆکراوەی نزم بۆوە

5- دووبارە بوونەوەی کۆکراوەیی نزم بۆوەی ڕێژەیی.

**3-2:-** ئەمەش بژاردەیەکی ڕەمەکییە، کە لە (100) قوتابی لەگەڵ نمرەکانیان لە وانەی ئابووری پێك هاتووە:-

| ئەنجامی وانەی ئابووری | ژمارەی قوتابیان |
|---|---|
| کەوتوو | 15 |
| پەسەند | 22 |
| ناوەند | 25 |
| باشە | 17 |
| زۆر باشە | 12 |
| نایاب | 9 |

**داواکاری :-** خشتەی دابەش کردنی دووبارەیی بەرز بۆوە دروست بکە .

**4-2:-** بە پشت بەستن بەپرسیاری (2-1) پلیکانی دووبارەیی و ( )بکێشە .

**5-2:-** بەپشت بەستن بەپرسیاری (2-2) پلیکانی دووبارەیی و چەماوەی دووبارەیی بکێشە .

**6-2:-** بەپشت بەستن بەپرسیاری (2-1) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرز بۆوەو ڕێژەیی بکێشە.

**7-2 :-** بەپشت بەستن بەپرسیاری (2-2) چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی نزم بۆوەو ڕێژەیی بکێشە .

**8-2 :-** ئەگەر بێتو ئەم داتایانەی خوارەوەت هەبێت کە نوێنەرایەتی بەرهەمی گەنم و جۆ لە هەرێمی کوردستان بە هەزاران تەن لەماوەی پێنج ساڵ دەکەن، هەروەکو لەم خشتەیەدا دیارە :-

| سالٌ | 2006 | 2007 | 2008 | 2009 | 2010 |
|---|---|---|---|---|---|
| بەرهەمی گەنم | 120 | 180 | 210 | 190 | 230 |
| بەرهەمی جۆ | 100 | 150 | 170 | 210 | 200 |

**داواکاری :**

1- ستوونی هێلکاری بۆ بەرهەمی گەنم لە هەرێمی کوردستان لەماوەی پێنج ساڵ بکێشە .

2- ستوونی هێلکاری بۆ بەرهەمی گەنم و جۆ لە هەرێمی کوردستان لەماوەی پێنج ساڵدا بکێشە.

**9-2 :-** هێلکاری بازنەیی بۆ بەکاربردنی ڕۆژانەی بەنزین لەپارێزگاکانی هەرێمی کوردستان بکێشە .

| پارێزگا | بەکاربردنی بەنزین |
|---|---|
| هەولێر | 800 |
| سلێمانی | 600 |
| دهۆك | 450 |

**10-2 :-** هێلکاری بازنەیی بۆ داهات و خەرجی کۆمپانیای شیشار لەماوەی (6) ساڵدا بکێشە.بەم شێوەیە :-

| سالٌ | 2005 | 2006 | 2007 | 2008 | 209 | 2010 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| داهات | 1200 | 2180 | 2210 | 2190 | 2300 | 3000 |
| خەرجییەکان | 1000 | 1150 | 1301 | 1100 | 1200 | 1500 |

## 1.3 : پێشەکی :

پێش ئەوەی دەست بەخوێندنی ئاماری ژمارەیی و پێوانەکردنییەوە بکەین، هەندێك ئامـاژەی ئامـاریی بـۆ داتاکـانی بەردەسـت پێشـکەش دەکـەین، لـەم بەشـەدا بـاس لـەگرینگترین هێمـاو زاراوەی بـەکارهێنراو لـە بەشـەکانی داهـاتوو دەکـەین، ئـەویش بـەم شێوەی خوارەوە :-

## 2.3 :- هێمای کۆکردنەوە : $\sum$

گریمـان کـە $x$ مانـای نمـرەی وانـەی ئـابووری بـۆ بژاردەیـەکی ڕەمـەکی (n=10) دەگەیەنێت، کەبریتییە لە قوتابیانی بەشی ئـابووری، کە $x_1$ بریتییە لـە نمـرەی وانـەی ئـابووری بـۆ قوتـابی یەکـەم، $x_2$ بریتییـە لـە نمـرەی وانـەی ئـابووری بـۆ قوتـابی دووەم،،...تا $x_{10}$ کە بریتییە لە نمرەی وانەی ئابووری بۆ دوا قوتـابی، سـەرنجی ئـەوە دەدرێت، کـە ئێمـە نمـرەی قوتابیـەکانمان بەدەسـت هێنـاوە، کـە بریتییـە لەزنجیرەیـەك ژمارە، ئەویش بەم شێوەیە :-

$$x_1, x_1, \cdots x_{10}$$

لەوکاتەدا سەرجەمی هەمووەکی ئەو ژمارانە بریتییە لـە: $x_1 + x_1 + \cdots + x_{10}$

ئینجا بۆ ئاسانکردنی نووسینی ئەو سـەرجەمە بەشـێوەیەك کە گوزارشـتی پـێ بکرێـت: $\sum_{i=1}^{10} x_i$ کە هێمای $\sum$ ئاماژە بەکردەی کۆکردنەوە دەکات، ئەمەش بریتییە لە پیتێکـی ئەغریقی بە Sigma ، دەخوێنرێتەوە i نوێنەرایەتی ئاماژە Subscript بـۆ زنجـیرەی ژمارە کردەی کۆکردنەوە دەکات، ئەگەر بێتو 1= i ئەمەش مانای ئەوەیە نمرەی قوتابی یەکەمە، 2= i واتە نمـرەی قوتـابی دووەمـە، بـە هـەمان شـێوە بـۆ نمرەکـانی تـر10= i قوتابیەکـە، تـا دەگاتـە دوا قوتـابی بژاردەکـە، ئـەو کردەیـە $\sum_{i=1}^{10} x_i$ کـە بـەم شـێوەیە دەخوێنرێت :- سەرجەمی زنجیرەی ژمارەکان بەنمرەی قوتابی یەکەم دەست پێدەکات 1= i بەنمرەی دوا قوتابی کۆتایی پێدەدات 10= i بەشـێوەیەکی گشـتی پـێ دەکرێت،

ئەگەر بێتو زنجیرەیەك برِمان هەبێت، کەژمارە یان n، ئـەوا سـەرجەمی هـەمووەکی بـەم شێوەیە گوزارشتی بۆ دەکرێت.

$\sum_{i=1}^{n} x_i$ ، لەسەر ئەم بنچینەیەدا دەتوانرێت گوزارشت بـەزنجیرەی برِەکـان بکرِێـت، کـە بریتییە لە $x_1 , x_1 , \cdots x_n$ بۆ چەند کردەیەکی جیاجیا بەم شێوەی خوارەوە :-

| هێمای کۆکردنەوە | کردە بە شێوەی هێما | کردەی پێویست |
|---|---|---|
| $\sum_{i=1}^{n} x_i$ | $x_1 + x_2 + \cdots + x_n$ | سەرجەمی بەهای داتای زنجیرەکان |
| $\sum_{i=1}^{n} x_i^2$ | $x_1^2 + x_2^2 + \cdots + x_n^2$ | سەرجەمی دووجای بەهای داتا زنجیرە ییەکان |
| $\left(\sum_{i=1}^{n} x_i\right)^2$ | $(x_1 + x_1 + \cdots + x_n)^2$ | دووجای سەرجەمی بەهای داتا زنجیرییەکان |
| $\sum_{i=1}^{n}\left(\frac{1}{x_i}\right)$ | $\frac{1}{x_1} + \frac{1}{x_2} + \cdots + \frac{1}{x_n}$ | سەرجەمی سەراوژێری بەهای داتا زنجیرییەکان |
| $\sum_{i=1}^{n}\left(\frac{1}{x_i^2}\right) = \sum_{i=1}^{n}\left(\frac{1}{x_i}\right)^2$ | $\frac{1}{x_1^2} + \frac{1}{x_2^2} + \cdots + \frac{1}{x_n^2}$ | سەرجەمی دووجای سەراوژێری داتا زنجیرە ییەکان |
| $\frac{1}{\sum_{i=1}^{n} x_i}$ | $\frac{1}{x_1 + x_2 + \cdots + x_n}$ | سەراوژێری سەرجەمی بەهای داتا زنجیرە ییەکان |
| $\frac{1}{\sum_{i=1}^{n} x_i^2}$ | $\frac{1}{x_1^2 + x_2^2 + \cdots + x_n^2}$ | سەراوژێری سەرجەمی دووجای بەهای داتا زنجیرە ییەکان |
| $\sum_{i=1}^{n} \log x_i$ | $\log x_1 + \log x_2 + \cdots + \log x_n$ | سەرجەمی لۆگاریتمی بەهای داتا زنجیرە ییەکان |
| $\log \sum_{i=1}^{n} x_i$ | $\log(x_1 + x_2 + \cdots + x_n)$ | لۆگاریتمی سەرجەمی بەهای داتا زنجیرە ییەکان |

| | | |
|---|---|---|
| $\sum_{i=1}^{n}\sqrt{x_i}$ | $\sqrt{x_1}+\sqrt{x_2}+\cdots+\sqrt{x_n}$ | **سەرجەمی ڕەگی بەهای داتا زنجیرە ییەکان** |
| $\sqrt{\sum_{i=1}^{n}x_i}$ | $\sqrt{x_1+x_2+\cdots+x_n}$ | **ڕەگی سەرجەمی بەهای داتا زنجیرە ییەکان** |

گریمان دوو زنجیرە داتامان هەیە $x$ و $y$ ژمارەی هەر یەکەیان بریتییە لە a و b لە بەهاکان و نوێنەرایەتی دوو بەهای نەگۆر دەکەن ئەوا:

1- سەرجەمی بڕی چەسپاو لە a بۆ n لە جارەکان بریتییە لە:

$$\sum_{i=1}^{n}a=a\sum_{i=1}^{n}(1)=a\cdot n$$

2- سەرجەمی جارانی چەسپاو a بەبەهای داتا زنجیرییەکان $x_i$ بریتییە لە:

$$\sum_{i=1}^{n}ax_i=a\sum_{i=1}^{n}x_i$$

3- سەرجەمی کۆکردنەوە یان کەمکردنەوەی چەسپاو a بۆ بەهای داتا زنجیرییەکان $x_i$ بریتییە لە:

$$\sum_{i=1}^{n}(x_i\mp a)=\sum_{i=1}^{n}x_i\mp\sum_{i=1}^{n}a=\sum_{i=1}^{n}x_i\mp a\sum_{i=1}^{n}(1)=\sum_{i=1}^{n}x_i\mp a\cdot n$$

4- سەرجەمی کۆکردنەوە، یان کەمکردنەوەی نێوان بەهای داتا زنجیرە ییەکانی $x_i$ و بەهای داتا زنجیرەییەکان $y_i$ بریتییە لە :

$$\sum_{i=1}^{n}(x_i\mp y_i)=\sum_{i=1}^{n}x_i\mp\sum_{i=1}^{n}y_i$$

5- سەرجەمی جارانی بەهای داتا زنجیرە ییەکان $x_i$ بەبەهای داتا زنجیرە ییەکانی $y_i$ کە لە بەرامبەری دایە، بریتییە لە:

$$\sum_{i=1}^{n}x_iy_i=x_1y_1+x_2y_2+\cdots+x_ny_n$$

6- سەرجەمی جارانی دوو کۆمەڵە، کۆمەڵەی یەکەم بریتییە لە بەهای داتا زنجیرە ییەکان $x_i$ بەزیادکردن یان کەمکردن، کە بەهای چەسپاوی a هەیە، لەگەڵ کۆمەڵەی دووەم، کە بریتییە لە بەهای داتا زنجیرە ییەکان $y_i$ بە زیاد کردن یان کەمکردن، کە بەهای چەسپاوی هەیە، ئەمەش بریتییە :-b کە:

$$\sum_{i=1}^{n}(x_i+a)(y_i+b)=\sum_{i=1}^{n}(x_iy_i+b\,x_i+a\,y_i+ab)$$

$$=\sum_{i=1}^{n}x_iy_i+b\sum_{i=1}^{n}x_i+a\sum_{i=1}^{n}y_i+abn$$

**نموونە** ( 1.3 ) :- گریمان ئەم داتایانەی خوارەوەت هەیە :-

ئەنجام بەم شێوەیە دەربهێنە:8 = a و b = 10

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| $x_i$ | 4 | 2 | 1 | 5 |
| $y_i$ | -3 | -1 | 0 | 6 |

| 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{\sum_{i=1}^{n}x_i^2}$ | $\frac{1}{\sum_{i=1}^{n}x_i}$ | $\sum_{i=1}^{n}\left(\frac{1}{x_i}\right)^2$ | $\sum_{i=1}^{n}\left(\frac{1}{x_i}\right)$ | $\left(\sum_{i=1}^{n}x_i\right)^2$ | $\sum_{i=1}^{n}x_i^2$ | $\sum_{i=1}^{n}x_i$ |
| 14 | 13 | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 |
| $\frac{ab}{\sum_{i=1}^{n}x_i}$ | $\sum_{i=1}^{n}ax_i$ | $\sum_{i=1}^{n}a$ | $\sqrt{\sum_{i=1}^{n}x_i}$ | $\sum_{i=1}^{n}\sqrt{x_i}$ | $\log\sum_{i=1}^{n}x_i$ | $\sum_{i=1}^{n}\log x_i$ |
| 20 | 19 | 18 | 17 | | 16 | 15 |
| $\sum_{i=1}^{n}(x_i-y_i)^2$ | $\sum_{i=1}^{n}(x_i-y_i)$ | $\sum_{i=1}^{n}(x_i+a)$ | $\sum_{i=1}^{n}(x_i+a)(y_i+b)$ | | $\sum_{i=1}^{n}x_iy_i^2$ | $\sum_{i=1}^{n}x_iy_i$ |

شیکار :- سەرنجی ئەوە دەدرێت لەمیانەی ئەم داتایانەی سەرەوە، کە 4= n دەتوانرێت ئەنجام بەگوزارشتی ماتماتیکی بکرێت، کە بریتییە لە :-

1 $$\sum_{i=1}^{n} x_i = \sum_{i=1}^{4} x_i = x_1 + x_2 + x_3 + x_4 = 4 + 2 + 1 + 5 = 12$$

2 $$\sum_{i=1}^{n} x_i^2 = \sum_{i=1}^{4} x_i^2 = x_1^2 + x_2^2 + x_3^2 + x_4^2 = 4^2 + 2^2 + 1^2 + 5^2 = 46$$

3 $$\left(\sum_{i=1}^{4} x_i\right)^2 = (x_1 + x_2 + x_3 + x_4)^2 = (4 + 2 + 1 + 5)^2 = 12^2 = 144$$

4 $$\sum_{i=1}^{4}\left(\frac{1}{x_i}\right) = \frac{1}{x_1} + \frac{1}{x_2} + \frac{1}{x_3} + \frac{1}{x_4} = \frac{1}{4} + \frac{1}{2} + \frac{1}{1} + \frac{1}{5} = 0.25 + 0.5 + 1 + 0.2 = 1.95$$

5 $$\sum_{i=1}^{4}\left(\frac{1}{x_i}\right)^2 = \sum_{i=1}^{4}\left(\frac{1}{x_i^2}\right)^2 = \frac{1}{x_1^2} + \frac{1}{x_2^2} + \frac{1}{x_3^2} + \frac{1}{x_4^2} = \frac{1}{4^2} + \frac{1}{2^2} + \frac{1}{1^2} + \frac{1}{5^2}$$

$$= \frac{1}{16} + \frac{1}{4} + \frac{1}{1} + \frac{1}{25} = 0.0625 + 0.25 + 1 + 0.04 = 1.3525$$

6 $$\frac{1}{\sum_{i=1}^{4} x_i} = \frac{1}{12} = 0.0833$$

7 $$\frac{1}{\sum_{i=1}^{4} x_i^2} = \frac{1}{46} = 0.0217$$

8 $$\sum_{i=1}^{4} \log x_i = \log x_1 + \log x_2 + \log x_3 + \log x_4$$

$$= \log 4 + \log 2 + \log 1 + \log 5$$

$$= 0.6021 + 0.3010 + 0 + 0.699 = 1.602$$

9 $$\log \sum_{i=1}^{4} x_i = \log 12 = 1.0792$$

10 $$\sum_{i=1}^{4}\sqrt{x_i}=\sqrt{x_1}+\sqrt{x_2}+\sqrt{x_2}+\sqrt{x_4}=\sqrt{4}+\sqrt{2}+\sqrt{1}+\sqrt{5}$$

$$=2+1.4142+1+2.2361=6.6503$$

11 $$\sqrt{\sum_{i=1}^{4}x_i}=\sqrt{12}=3.4641$$

12 $$\sum_{i=1}^{4}a=a\sum_{i=1}^{4}(1)=a\cdot 4=(8)(4)=32$$

13 $$\sum_{i=1}^{4}ax_i=a\sum_{i=1}^{4}x_i=(8)(12)=96$$

14 $$\frac{ab}{\sum_{i=1}^{4}x_i}=\frac{(8)(10)}{12}=6.6667$$

15 $$\sum_{i=1}^{4}x_iy_i=x_1y_1+x_2y_2+x_3y_3+x_4y_4=(4)(-3)+(2)(-1)+(1)(0)+(5)(6)$$

$$=-12-2+0+30=16$$

16 $$\sum_{i=1}^{4}x_iy_i^2=x_1y_1^2+x_2y_2^2+x_3y_3^2+x_4y_4^2$$

$$=(4)(-3)^2+(2)(-1)^2+(1)(0)^2+(5)(6)^2=36+2+0+180=218$$

17 $$\sum_{i=1}^{4}(x_i+a)(y_i+b)=\sum_{i=1}^{4}(x_iy_i+b\,x_i+a\,y_i+ab)$$

$$=\sum_{i=1}^{4}x_iy_i+b\sum_{i=1}^{4}x_i+a\sum_{i=1}^{4}y_i+abn$$

$$=16+(10)(12)+(8)(2)+(8)(10)(4)=472$$

18 $$\sum_{i=1}^{4}(x_i+a)=\sum_{i=1}^{4}x_i+\sum_{i=1}^{4}a=\sum_{i=1}^{4}x_i+a\sum_{i=1}^{4}(1)$$

$$=\sum_{i=1}^{4}x_i+a\cdot 4=12+(8)(4)=44$$

19 $$\sum_{i=1}^{4}(x_i - y_i) = \sum_{i=1}^{4}x_i - \sum_{i=1}^{4}y_i = 12 - 2 = 10$$

20 $$\sum_{i=1}^{n}(x_i - y_i)^2 = (x_1 - y_1)^2 + (x_2 - y_2)^2 + (x_3 - y_3)^2 + (x_4 - y_4)^2$$

$$= (4-(-3))^2 + (2-(-1))^2 + (1-0)^2 + (5-6)^2$$

$$= (7)^2 + (3)^2 + (1)^2 + (-1)^2 = 60$$

**3.3 :- هێمـای جـاران :-** هەنـدێك جـار پێویسـتمان بـەکردەی جـارانی کۆمـەڵێك بڕەکان بەیەکترییەوە دەکرێت، ئەمەش پێویستی بەهێمارێژی هەیە بۆ ئاسانی نووسـینی ئەو هێمایە، کە بریتییە لە ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر بـوونی کـردەی جـارانی کۆمـەڵێك لـە بڕەکان، ئەگەر بێتو کۆمەڵێك لە بەهای داتا زنجیرە ییەکان بریتییە لە:

$$x_1 , x_1 , \cdots x_n$$

\

ئەوا جارانی ئەو بڕانە بەیەکترەوە، بەم شێوەیە دەبێت :

$$\prod_{i=1}^{n} x_i = x_1 . x_2 . \cdots . x_n$$

ئەو کردەیەش بەم شێوەیە دەخوێنرێت، کە جارانی بەهای داتـا زنجیرەییـەکانی بڕەکـان بەیەکترەوە، کە بەبەهای یەکەم $i = 1$ دەست پێدەکات و بە دوا بـەها $i = n$ ، کۆتـایی دێت. گریمان دوو زنجیرە داتامان هەیە $x$ و $y$ ژمارەی هەر یەکەیان بریتییە لە $n$ لە بەهاو $a$ و $b$ مان هەیە، کە بریتییە لە هەردوو بەهای چەسپاو، ئەوا:-

| ئاسانکردنی کردەکان | هێمای جاران |
|---|---|
| $a^n$ | $\prod_{i=1}^{n} a$ |
| $a^n \cdot \prod_{i=1}^{n} x_i$ | $\prod_{i=1}^{n} a x_i$ |
| $(ab)^n \prod_{i=1}^{n} x_i \prod_{i=1}^{n} y_i$ | $\prod_{i=1}^{n} a b x_i y_i$ |
| $\frac{1}{\prod_{i=1}^{n} x_i}$ | $\prod_{i=1}^{n} \frac{1}{x_i}$ |

| هێمای جاران | ئاسانكردنی كردەكان |
|---|---|
| $\log \prod_{i=1}^{n} x_i$ | $\sum_{i=1}^{n} \log x_i$ |
| $\prod_{i=1}^{n} \sqrt{x_i}$ | $\sqrt{\prod_{i=1}^{n} x_i}$ |
| $\prod_{i=1}^{n} x_i^a$ | $\left(\prod_{i=1}^{n} x_i\right)^a$ |
| $\log \prod_{i=1}^{n} x_i^a$ | $a\sum_{i=1}^{n} \log x_i$ |
| $\prod_{i=1}^{n} \frac{x_i}{y_i}$ | $\frac{\prod_{i=1}^{n} x_i}{\prod_{i=1}^{n} y_i}$ |

**2.3** ئەگەر بێتو ئەم داتایانەی خوارەوەت هەبێت :–

| | | | |
|---|---|---|---|
| $x_i$ | 7 | 1 | 5 |
| $y_i$ | 2 | 0 | 4 |

ئەنجامەكە بەم شێوەیە بدۆزەرەوە: **a = 6 و b = 8**

| 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
|---|---|---|---|---|
| $\prod_{i=1}^{n} a\,b\,x_i y_i$ | $\prod_{i=1}^{n} a\,x_i$ | $\prod_{i=1}^{n} a$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i^2$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i$ |
| **10** | **9** | **8** | **7** | **6** |
| $\log \prod_{i=1}^{n} x_i^{a\,y_i}$ | $\log \prod_{i=1}^{n} x_i^a$ | $\log \prod_{i=1}^{n} x_i$ | $\prod_{i=1}^{n} \frac{1}{x_i^2}$ | $\prod_{i=1}^{n} \frac{1}{x_i}$ |
| **15** | **14** | **13** | **12** | **11** |
| $\prod_{i=1}^{n} (x_i - a)^2$ | $\prod_{i=1}^{n} (x_i - y_i)^2$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i y_i^2$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i^a$ | $\prod_{i=1}^{n} \sqrt{x_i}$ |

**شیكار:** سەرنجی ئەوە دەدەین لە میانەی ئەنجامەكانی سەرەوە n =3 دەتوانرێت ئەنجامەكان بە گوزارشتی ماتماتیكی بەم شێوەیە دەربهێنین:

1 $$\prod_{i=1}^{n} x_i = \prod_{i=1}^{3} x_i = (x_1 \cdot x_2 \cdot x_3) = (7)(1)(5) = 35$$

2 $$\prod_{i=1}^{3} x_i^2 = x_1^2 \cdot x_2^2 \cdot x_3^2 = (7)^2 (1)^2 (5)^2 = 1225$$

$$or \quad = (x_1 \cdot x_2 \cdot x_3)^2 = [(7)(1)(5)]^2 = [35]^2 = 1225$$

3 $$\prod_{i=1}^{3} a = a^3 = 6^3 = 216$$

4 $$\prod_{i=1}^{3} a\, x_i = a^3 \cdot \prod_{i=1}^{3} x_i = 6^3 \cdot 35 = 7560$$

5 $$\prod_{i=1}^{3} ab\, x_i y_i = (ab)^3 \prod_{i=1}^{3} x_i \prod_{i=1}^{3} y_i = (6 \cdot 8)^2 35 \cdot 0$$

$$= (2304)(35)(0) = 0 \quad where \quad \prod_{i=1}^{3} y_i = (2)(0)(4) = 0$$

6 $$\prod_{i=1}^{3} \frac{1}{x_i} = \frac{1}{x_1} \cdot \frac{1}{x_2} \cdot \frac{1}{x_3} = \frac{1}{7} \cdot \frac{1}{1} \cdot \frac{1}{5} = \frac{1}{35} = 0.0286$$

7 $$\prod_{i=1}^{3} \frac{1}{x_i^2} = \frac{1}{x_1^2} \cdot \frac{1}{x_2^2} \cdot \frac{1}{x_3^2} = \frac{1}{[(7)(1)(5)]^2} = \frac{1}{(35)^2} = \frac{1}{1225} = 0.0008$$

8 $$\log \prod_{i=1}^{3} x_i = \sum_{i=1}^{3} \log x_i = \log x_1 + \log x_2 + \log x_3$$

$$= \log 7 + \log 1 + \log 5$$

$$= 0.8451 + 0 + 0.699 = 1.5441$$

9 $$\log \prod_{i=1}^{3} x_i^a = a \sum_{i=1}^{3} \log x_i = (6) \cdot (1.5441) = 9.2646$$

**10** $$\log\prod_{i=1}^{3} x_i^{a\,y_i} = a\sum_{i=1}^{3} y_i \log x_i$$

$$= a\cdot\left[y_1\log x_1 + y_2\log x_2 + y_3\log x_3\right]$$

$$= 6\cdot\left[2\cdot\log 7 + 0\cdot\log 1 + 4\cdot\log 5\right]$$

$$= 6\cdot\left[2\cdot 0.8451 + 0\cdot 0 + 4\cdot 0.699\right] = 6\cdot 4.4862 = 26.9172$$

**11** $$\prod_{i=1}^{3}\sqrt{x_i} = \sqrt{x_1}\cdot\sqrt{x_2}\cdot\sqrt{x_3} = \sqrt{7}\cdot\sqrt{1}\cdot\sqrt{5} = (2.6457)(1)(2.2361) = 5.9161$$

*or* $$= \sqrt{(7)(1)(5)} = \sqrt{35} = 5.9161$$

**12** $$\prod_{i=1}^{3} x_i^a = x_1^a\cdot x_2^a\cdot x_3^a = 7^6\cdot 1^6\cdot 5^6$$

$$= (117649)(1)(15625) = 1838265625$$

*or* $$= (x_1\cdot x_2\cdot x_3)^a = (7\cdot 1\cdot 5)^6 = (35)^6 = 1838265625$$

**13** $$\prod_{i=1}^{3} x_i y_i^2 = (x_1 y_1^2)(x_2 y_2^2)(x_3 y_3^2)$$

$$= (7\cdot 2^2)(1\cdot 0^2)(5\cdot 4^2) = (28)(0)(80) = 0$$

**14** $$\prod_{i=1}^{3}(x_i - y_i)^2 = (x_1 - y_1)^2(x_2 - y_2)^2(x_3 - y_3)^2$$

$$= (7-2)^2(1-0)^2(5-4)^2 = 5^2\cdot 1^2\cdot 1^2 = 25$$

**15** $$\prod_{i=1}^{3}(x_i - a)^2 = (x_1 - a)^2(x_2 - a)^2(x_3 - a)^2$$

$$= (7-6)^2(1-6)^2(5-6)^2 = (1)^2(-5)^2(-1)^2 = 1\cdot 25\cdot 1 = 25$$

# ڕاهێنانی بەشی سێیەم

**3–1:–** ئەگەر بێتو ئەم داتایانەی خوارەوەت هەبێت :–

| $x_i$ | -3 | 0 | 3 | 6 | 9 |
|---|---|---|---|---|---|

ئەنجامەکان بەم شێوەیە بدۆزەرەوە: k = 5

| 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{\sum_{i=1}^{n} x_i^2}$ | $\frac{1}{\sum_{i=1}^{n} x_i}$ | $\sum_{i=1}^{n}\left(\frac{1}{x_i}\right)^2$ | $\sum_{i=1}^{n}\left(\frac{1}{x_i}\right)$ | $\left(\sum_{i=1}^{n} x_i\right)^2$ | $\sum_{i=1}^{n} x_i^2$ | $\sum_{i=1}^{n} x_i$ |
| **14** | **13** | **12** | **11** | **10** | **9** | **8** |
| $\frac{k}{\sum_{i=1}^{n} x_i}$ | $\sum_{i=1}^{n} kx_i$ | $\sum_{i=1}^{n} k$ | $\sqrt{\sum_{i=1}^{n} x_i}$ | $\sum_{i=1}^{n} \sqrt{x_i}$ | $\log \sum_{i=1}^{n} x_i$ | $\sum_{i=1}^{n} \log x_i$ |

**3–2:–** گریمان دوو زنجیرە داتامان هەیە :–

| $x_i$ | 0 | 2 | 4 | 6 | 8 | 10 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| $y_i$ | 1 | 3 | 5 | 7 | 9 | 11 |

ئەنجامەکان بەم شێوەیە بدۆزەرەوە: z = 5 ، s = 3

| 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
|---|---|---|---|---|
| $\prod_{i=1}^{z}(x_i - s)^2$ | $\prod_{i=1}^{s}(x_i - y_i)^2$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i y_i^2$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i^z$ | $\prod_{i=1}^{n} \sqrt[s]{x_i y_i}$ |

**1-3** **3–3:–** : ئەگەر بێتو $d_i$ بریتییە لە خەرجی مانگانەی خێزان، لە هەمان کاتدا بریتییە لە دەسهات $g_i$ بۆ بژاردەی ڕەمەکی بەم شێوەی خوارەوەیە:–

| $d_i$ | 105 | 206 | 300 | 121 | 238 | 100 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| $g_i$ | 200 | 300 | 500 | 340 | 340 | 110 |

ئەمانە بدۆزەرەوە: ئەگەر بێتوو a = 3

| 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{an}{\sum_{i=1}^{n} g_i}$ | $\sum_{i=1}^{a} n d_i$ | $\sum_{i=1}^{n} a$ | $\sqrt{\sum_{i=1}^{n} g_i}$ | $\sum_{i=1}^{a} \sqrt{d_i}$ | $\log \sum_{i=1}^{n} g_i$ | $\sum_{i=1}^{n} \log d_i$ |
| 13 | 12 | 11 | 10 | | 9 | 8 |
| $\sum_{i=1}^{n} (d_i - g_i)^2$ | $\sum_{i=1}^{n} (g_i - d_i)$ | $\sum_{i=1}^{a} (g_i + a)$ | $\sum_{i=1}^{n} (g_i + a)(d_i + n)$ | | $\sum_{i=1}^{n} d_i g_i^2$ | $\sum_{i=1}^{n} d_i g_i$ |

**4-3:- گریمان دوو زنجیرەی داتاکان بریتییە لە :-**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| $x_i$ | 3 | 5 | 8 | 2 |
| $y_i$ | 2 | 6 | 4 | 5 |

**داواکاری: بەهای ئەمانە بدوزەرەوە:**

| 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |
|---|---|---|---|---|
| $\log \prod_{i=1}^{2} x_i^{4y_i}$ | $\log \prod_{i=1}^{n} x_i^3$ | $\log \prod_{i=1}^{2} x_i$ | $\prod_{i=1}^{n} \frac{1}{x_i^2}$ | $\prod_{i=1}^{3} \frac{1}{x_i}$ |
| 10 | 9 | 8 | 7 | 6 |
| $\prod_{i=1}^{n} (x_i - 12)^2$ | $\prod_{i=1}^{n} (x_i - y_i)^2$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i y_i^2$ | $\prod_{i=1}^{n} x_i^5$ | $\prod_{i=1}^{n} \sqrt{x_i}$ |

## 1-4:- پێشەکی:

زۆر جار هەیە پێویستمان بەهەژمارکردنی هەندێك ئامارژە هەیە، کە داتاکان بەکەمترین ووردەکاری پوخت دەکەن، یان مۆدیلێك، کە نوێنەرایەتی کۆمەڵەی ئامارو پێکهاتەکانی دەکات، یاخود پێوەرێکە پێوانەی ئەو پێکهاتانە دەکات و بەهۆیەوە بەراورد لە گەڵ کۆمەڵەی ئاماریی دیکە دەکرێت، لەسەر ئەو بنچینەیە دەتوانرێت کۆمەلە داتایەك بە یەك بەها نوێنەرایەتی بکرێت، ئامانجیش لەمە بریتییە لەپێدانی وێنەیەکی خێرا لە چەندیتی ئەو کۆمەڵەیە، کە لەمیانەیدا ژمارە دەدۆزێتەوە تا نوێنەرایەتی بکات، ئەو پێوەرەی تایبەتمەندە بەدیارکردنی ئەو ژمارەیە پێ دەگوترێت پێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی، یان پێوەری ناوەندی (نێوەنجی) ئەو ژمارەیە، کاتێك بەپێ ی بچووکی یان گەورەیی رێك دەخرێت، واتە ئەو ژمارەیە بەرەو چەقبەندی نێوەنجی ئەو کۆمەلەیە دەچێت، کە هەژمار کراوە، بۆیە ناوی لێنراوە ( پێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی)، کەسوودمەندە لەلێکۆڵینەوەی خەسڵەتەکانی کۆمەڵگا، ئەویش لەمیانەی خەسڵەتەکانی بژاردە، کەبە تاکە نێوەنجی دادەنرێت، لەم بەشەدا باس لە پێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی بۆ داتا ڕیزکراوەکان و نا ڕیزکراوەکان دەکەین :—

## 2.4:- نێوەنجی هەژمارکردن ( Mean )

بەیەکێك لە گرنگترین پێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی دادەنرێت، ئەویش بەهۆی بوونی ژمارەیەك خەسڵەتی باش و ئاسان لە هەژمارکردندا، ئەمەش وای کردووە لە پێشەوەی ئەو پێوەرانە بێت، هەروەها نێوەنجی هەژمارکردن بەپێوەرێك دادەنرێت، کە لەسەر ئاستێکی بەرفرەوان بەکاردەهێنرێت، ئەویش لەبەر ئەوەیە هەموو بەهاکان لە کاتی هەژمارکردن لەبەر چاو دەگرێت، پێویستیشی بەرێکخستنی داتاکان نییە، بەڵام لەخەوشەکانی ئەوەیە کارێگارە بەبەها شازەکان یان بەهای لایەنی شازی داتاکان، ئەمەو دەتوانرێت داتا ڕیزکراوەکان و داتا ناڕیزکراوەکان هەژمار بکرێت، ئەویش بەم شێوەیە:—

## أ- نێوەنجی هەژمارکردن بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان :-

ژمارکردنی نێوەنجی هـەژمارکردن بـۆ داتـا نـا ریزکراوەکـان لەمیانـەی کۆکردنـەوەی هـەموو بـەهای بینـەرەکانی بـژاردن $(x_1, x_2, \ldots, x_n)$ دەبێـت، کـە وەرگـیراوە لـە کۆمەڵگای دیاردەیەك لە دیاردەکانـەوە، ئەمـەش بەسـەرقەبارەی ئـەو بژاردەیـە دابـەش، بۆیـــــە $(\bar{x})$ نێـــــوەنجی هـــــەژمارکردنی بـــــژاردە کـــــە بریتییـــــە لـــــە :- دەکرێت

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} \qquad \cdots \quad (4.1)$$

مەزندەیـەکی نـامتحیزە بـۆ تێکـڕای بینـەرانی کۆمـەڵگا، $(\bar{x})$ نێـوەنجی هـەژمارکردن وەردەگرێـت، کـە بـژاردەی تێـدا دیـاری کـراوە، تێکـڕای کۆمـەڵگاش هێمـای $(\mu)$ و دەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقە ژمار بکرێت:

$$\mu = \frac{\sum_{i=1}^{N} x_i}{N} \qquad \cdots \quad (4.2)$$

**نموونە (1.4):** گریمان ئەم داتایانەی خوارەوەت هەیە، کە بریتییە لە نمرەی بژاردەی قوتابیان کـە ژمارەییـان (15) قوتابییـە لەوانـەی ئـابووری، داواکـاری نێـوەنجی نمـرەی قوتابیان بدۆزەرەوە:-

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $x_i$ | 65 | 66 | 58 | 56 | 75 | 43 | 25 |
| 56 | 90 | 78 | 32 | 59 | 35 | 42 | 80 |

**شیکار:-**

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{1}{15}(65 + 66 + \cdots + 80) = \frac{860}{15} = 57.3333$$

ئەمـەش مانـای ئەوەیـە، کـە نێـوەنجی نمـرەی قوتابیـان لەوانـەی ئـابووری بریتییـە لـە (57.3333) ئینجا ئەگـەر داتاکانمـان بەشـێوەی بـەرز بـۆوە ڕێکخسـت، ئـەوا بـەهای $(\bar{x})$ دەکەوێتە ناوەراستی داتاکانەوە .

**نموونە (2.4)** : ئەم داتایانەی خوارەوە، بریتییە لەژمارەی بژاردەی ئەندامانی خێزان، کە ژمارەییان (10) خێزانە:

| $x_i$ | 3 | 7 | 8 | 12 | 8 | 2 | 5 | 6 | 5 | 4 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

**داواکاری:** نێوەنجی ژمارەی ئەندامانی خێزان بدۆزەرەوە.

**شیکار :-**

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{1}{10}(3+7+\cdots+4) = \frac{60}{10} = 6$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ژمارەی ئەندامانی خێزان بریتییە لە(6) کەس .

**نموونە (3.4):-** ئەم داتایانەی حوارەوە بریتییە لەداهاتی مانگانە (بەهەزار دینار) بۆ بژاردەیەك کە بریتییە لە (6) خێزان لەشاری هەولێر بەم شێوەی خوارەوە :-

| $y_i$ | 300 | 800 | 1200 | 790 | 200 | 500 |
|---|---|---|---|---|---|---|

**داواکاری :-** نێوەنجی هەژمارکردنی داهاتی مانگانەی ئەو بژاردەیە بدۆزەرەوە.

**شیکار:-**

$$\bar{y} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{1}{6}(300+800+\cdots+500) = \frac{3790}{6} = 631.6667$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە نێوەنجی داهاتی مانگانەی ئەو خێزانانەی بژاردەکە بریتییە لە (631.6667)دینار .

## ب- نێوەنجی هەژمارکردنی داتا ڕیزکراوەکان :-

نێوەنجی داتا ڕیزکراوەکان لە میانەی هەژمارکردنی سەنتەری توێژەکان ($x_i$) دەبێت، ئینجا هەریەکەیان جارانی دووبارە بوونەکانی بەرامبەرییان دەکرێت ($f_i$) دوای ئەوە ئەنجامەکان کۆدەکرێنەوەو دابەش دەکرێت بەسەر سەرجەمی دووبارەبوونەکان، واتە:-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} f_i} \quad \cdots \quad (4.3)$$

**نموونە (4.4) :-** ئەم خشتەیەی خوارەوە بڕی بەرهەم (بەپارچە) بۆ پەنجا کرێکار لە کارگەی هەولێرو ژمارەی کرێکاران بۆ هەرتوێژێك لەتوێژەکان نیشان دەدات :-

| **توێژی بەرهەم** | -100 | -110 | -120 | -130 | -140 | -150 | -160 | -170 180 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **ژمارەی کرێکار** | 4 | 7 | 8 | 10 | 7 | 6 | 5 | 3 |

**داواکاری :-** نێوەنجی بەرهەمداری کرێکار بە پارچە دیاربکە .

**شیکار :-** یەکەمجار هەڵدەستین بە دروست کردنی خشتەیەك، کەتوێژی بەرهەم لەبەرامبەر ژمارەی کرێکار ($f_i$) نیشان دەدات، ئینجا هەژماری سەنتەری توێژەکان لەم میانەی دا دەکەین :-

- سەبارەت بەسەنتەری توێژی یەکەم بریتییە لە :-

$$x_1 = \frac{L.L + U.L}{2} = \frac{100 + 110}{2} = 105$$

- سەبارەت بەسەنتەری توێژی دووەم بریتییە لە :-

$$x_2 = \frac{L.L + U.L}{2} = \frac{110 + 120}{2} = 115$$

بەم شێوەیە بۆ ئەوانی تر...هەر لەمیانەی ئەم خشتەیەدا هەژماری جارانی سەنتەری توێژەکان بۆ دووبارەبوونەکانی بەرامبەریان بەدیار دەکەوێت، کەلەم خشتەیە ڕوون کراوەتەوە :-

| **توێژی بەرهەم** | **دووبارەکان $f_i$ (ژمارەی کرێکار)** | **سەنتەری توێژەکان $x_i$** | $f_i x_i$ |
|---|---|---|---|
| 100- | 4 | 105 | 420 |
| 110- | 7 | 115 | 805 |
| 120- | 8 | 125 | 1000 |
| 130- | 10 | 135 | 1350 |
| 140- | 7 | 145 | 1015 |
| 150- | 6 | 155 | 930 |
| 160- | 5 | 165 | 825 |
| 170-180 | 3 | 175 | 525 |
| **سەرجەم** | 50 | | 6870 |

بۆیە:

$$\overline{x} = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} f_i} = \frac{\sum_{i=1}^{8} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{8} f_i} = \frac{f_1 x_1 + f_2 x_2 + \cdots f_8 x_8}{f_1 + f_2 + \cdots + f_8}$$

$$= \frac{(4)\cdot(105)+(7)\cdot(115)+\cdots+(3)\cdot(175)}{4+7+\cdots+3} = \frac{6870}{50} = 137.4$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەنێوەنجی بەرهەمی کرێکار بریتییە لە (137.4) پارچە .

**نموونە (5.4) :-** بەپشت بەستن بەخشتەی نموونەی (1.2) بۆ لێکۆڵینەوە لەکرێ ی کرێکاری ڕۆژانە ( بەهەزار دینار) بۆ کەرستەی بیناسازی، بەم شێوەی خوارەوە :-

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان (کرێ) | دووبارەکان $f_i$ (ژمارەی کرێکار) | سەنتەری توێژەکان $x_i$ |
| --- | --- | --- | --- |
| 1 | 29-26 | 5 | 27.5 |
| 2 | 33-30 | 12 | 31.5 |
| 3 | 37-34 | 11 | 35.5 |
| 4 | 41-38 | 9 | 39.5 |
| 5 | 45-42 | 5 | 43.5 |
| 6 | 49-46 | 3 | 47.5 |

**داواکاری :-** نێوەنجی کرێ ی ڕۆژانە بۆ کرێکارانی ئەو کارگەیە بدۆزەرەوە ؟

**شیکار :-** لەمیانەی خشتەی دووبارەیی، دەتوانرێت نێوەنج بەم شێوەیە هەژماربکرێت:-

$$\overline{x} = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} f_i} = \frac{\sum_{i=1}^{6} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{6} f_i} = \frac{f_1 x_1 + f_2 x_2 + \cdots + f_6 x_6}{f_1 + f_2 + \cdots + f_6}$$

$$= \frac{(5)\cdot(27.5)+(12)\cdot(31.5)+\cdots+(3)\cdot(47.5)}{5+12+\cdots+3} = \frac{1621.5}{45} = 36.0333$$

نێوەنجی کرێ ی ڕۆژانەی کرێکاران بریتییە لە ( 36.0333) هەزاردینار

**نموونە (6.4):-** بەپشت بەستن بەخشتەی دووبارەیی نموونەی (2.2) بۆ داتاكان، كە بریتییە لەبڕی بەرهەمی گەنم بۆ هەر دۆنمێك لە (60) پارچە زەوی كشتوكاڵی، داواكاری هەژماری نێوەنجی بڕی بەرهەمی گەنم بۆ یەك دۆنم بكە ؟

**شیكار :-** لە میانەی خشتەی دووبارەیی نموونەی (2.2) دەتوانرێت ئەمەی خوارەوە بە دەست بهێنرێت .

| تویژەكان (بڕی بەرهەمی گەنم بەتەن) | دووبارەكان $f_i$ (ژمارەی پارچە زەوی) | سەنتەری تویژەكان $x_i$ | $f_i x_i$ |
|---|---|---|---|
| 26.70-17.83 | 1 | 22.27 | 22.27 |
| 35.56-26.70 | 14 | 31.13 | 435.82 |
| 44.42-35.56 | 20 | 39.00 | 780 |
| 53.28-44.42 | 8 | 48.86 | 390.88 |
| 62.15-53.28 | 7 | 57.73 | 404.11 |
| 71.02-62.15 | 6 | 66.59 | 399.54 |
| 79.88-71.02 | 4 | 75.46 | 301.84 |
| سەرجەم | 60 | | 2734.46 |

هەروەها لەمیانەی خشتەی دووبارەیی، دەتوانرێت نێوەنج بەم شێوەیە هەژماربكرێت :-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} f_i} = \frac{\sum_{i=1}^{7} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{7} f_i} = \frac{f_1 x_1 + f_2 x_2 + \cdots + f_7 x_7}{f_1 + f_2 + \cdots + f_7}$$

$$= \frac{(1)\cdot(22.27) + (14)\cdot(31.13) + \cdots + (4)\cdot(75.46)}{1 + 14 + \cdots + 4} = \frac{2734.46}{60} = 45.5743$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، كە نێوەنجی بڕی بەرهەمی گەنم لە یەك دۆنمدا بریتییە لە (45.5743) تەن .

**تێبینی :-** ئەم ڕێگایەیی سەرەوە دەتوانرێت لە دۆخی یەكسانی درێژەی تویژەكان و دۆخی نایەكسان بەكاردەهێنرێت، لە گەڵ بوونی جۆری دیكە، كەبوار نییە لێرەدا بیخەینە ڕوو .

## لایـــەنی پۆزەتیـــڤ و نێگەتیڤـــەکانی نێـــوەنجی هـــەژمارکردن :-

ئەمـــەش لایـــەنی پـــۆزەتیڤ و نێگـــەتیڤی نێـــوەنجی هـــەژمارکردن دەخاتـــە ڕوو:-

**أ- لایـــــــــەنی پـــــــــۆزەتیڤی نێـــــــــوەنجی هـــــــــەژمارکردن :-**

لایەنـــە باشـــەکانی نێـــوەنجی هـــەژمارکردن بـــەم خاڵانـــە دەناســـرێتەوە :-

1- بیرۆکەکـــــــەی ســـــــادەیەو بەئاســـــــانی هـــــــەژماردەکرێت .

2- هەموو داتاکان وەردەگرێت و لە هەژمارکردن لە بەرچاوییان دەگرێت .

3- دەتوانرێـــت هـــەژمار بکرێـــت بـــە پشـــت بەســـتن بـــەکردەی جـــەبری .

**ب- لایەنە نێگەتیڤەکانی نێوەنجی هەژمارکردن :-**

نێـــوەنجی هـــەژمارکردن ئـــەم خەوشـــانەی خـــوارەوەی هەیـــە :-

1- ناتوانرێت دیاری بکرێت، بەسەیرکردن بۆ داتاکان یان بەشێوەی ئەندازەیی.

2- ناتوانرێت هەژماری داتا باسەنییەکان بکرێت، کە قابیلی ڕێکخستن نیین (بەناو Nominal) وەك :- ڕەگەز، نەتەوە.

3- ناتوانرێت ژمار بکرێت لەکاتی بوونی بەهای نادیار، تەنیا دوای مەزندەکردنی نەبێت .

4- زۆر بە بەها شازەکان و لایەنی شازەکان کارێگاردەبێت .

**خەسڵەتەکانی نێوەنجی هەژمارکردن :-**

1- سەرجەمی لادانی بەهای گۆڕاو ($x$)

لە نێوەنجی هەژمارکردن، کەتیایدا ژمارکراوە، یەکسان دەبێت بە سفر، واتە :-

$$d_i = x_i - \bar{x}$$

$$\Rightarrow \sum_{i=1}^{n} d_i = \sum_{i=1}^{n} \left(x_i - \bar{x}\right) = \sum_{i=1}^{n} x_i - \sum_{i=1}^{n} \bar{x} = \sum_{i=1}^{n} x_i - n\,\bar{x}$$

$$= n\bar{x} - n\bar{x} = 0$$

2- سەرجەمی دووجای لادانی بەهای($x$)

لە نێوەنجی هەژمارکردن ، کەتیایدا هەژمارکراوە، ئەوا کەمتر دەبێت ، واتە :-

$$\sum_{i=1}^{n} d_i^2 < \varepsilon$$

## 3.4:- نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو :- Weighted Mean

زۆر لە دۆخەکان، هەندێك لە پێکهاتە گرینگی لە پێکهاتەی دیکە زیاترە، ئەمەش پێویست دەکات لەکاتی دەرهێنانی نێوەنجی هەژمارکردن لە بەر چاو بگیرێت، بۆ نموونە لە کاتی ژماردنی تێکڕای نمرەکانی قوتابیەکی دەرچوو لە کۆلیژ، پێویست دەکات ژمارەی کاتژمێرەکانی هەفتە بۆ هەر وانەیەك لە وانەکان بۆ ژمارکردنی تێکڕای قوتابی لە بەرچاو بگیرێت، ئەمەش مانای کردەی کێش کردن دەگەیەنێت، کەگرنگی هەریەکەیان دیار دەکات، ئەو کێشانەش زۆرجار لەمەوپێش دیاریکراوە، دەتوانرێت هەژماری داتا نارێزکراوەکان و داتا ڕیزکراوەکان بکرێت ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

### أ- نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراوی داتا نا ڕیزکراوەکان :

گریمان کە $\left(x_1, x_2, \ldots, x_n\right)$

بریتییە لەپێوانەی بژاردەیەك بۆ دانەکانی ، کەژمارەیان ( n )

لە داتا نا ڕیزکراوەکان، ئەمانەش $\left(w_1, w_2, \ldots, w_n\right)$

بریتییە لە کێشی ئەو داتایانە، ئەوکاتەش نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت :-

$$\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{n} w_i x_i}{\sum_{i=1}^{n} w_i} \qquad \cdots(4.4)$$

لەمەی پێشوو سەرنجی ئەوە دەدرێت، کە نێوەنجی کێشکراو، ئەمەش دۆخێکی زۆر گشتگیرە لە نێوەنجی هەژمارکردنی ئاسایی، واتە نێوەنجی هەژمارکردنی ئاسایی بریتییە لە دۆخێکی تایبەتی یە لە نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو، کاتێك سەیری هەموو تاکەکانی بەهەمان گرنکی (کێش) دەکەن.

**بۆگریمان**:-

$$w_i = w \quad i.e \quad w_1 = w_2 = \ldots = w_n = w \qquad \forall \quad i$$

$$\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{n} w_i x_i}{\sum_{i=1}^{n} w_i} = \frac{\sum_{i=1}^{n} w x_i}{\sum_{i=1}^{n} w} = \frac{w \sum_{i=1}^{n} x_i}{w \sum_{i=1}^{n} 1} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \bar{x}$$

تێبینی ئەوە دەکرێت، کە ئەنجامی کۆتایی بریتییە لە نێوەنجی هەژمارکردنی ئاساییە.

**نموونە** (7.4) :- ئەمەی خوارەوە بریتییە لە نمرەی یەکێك لەقوتابیانی بەشی ئابووری یە بۆ وانەکانی بە پێ ی کاتژمێرەکانی هەفتە بۆ هەر وانەیەك لەوانەکان، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 70 | 87 | 86 | 84 | 88 | 75 | 80 | 52 |
| 3 | 3 | 3 | 3 | 3 | 2 | 2 | 2 |

**داواکاری**:- نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو بدۆزەرەوە .

**شیکار** :- سەرنجی ئەوە دەدرێت، کە جیاوازی لەژمارەی کاتژمێرەکانی هەفتانە بۆ هەروانەیەك دیاریکراوە، بۆیە پێویست دەکات نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو بدۆزەرەوە بەم شێوەی خوارەوە :-

$$\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{n} w_i x_i}{\sum_{i=1}^{n} w_i} = \frac{(3 \times 70) + (3 \times 87) + \ldots + (2 \times 52)}{3 + 3 + \ldots + 2} = \frac{1659}{21} = 79$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەتێکڕای قوتابیەکە بریتییە لەنمرەی (79)، لەبەرامبەر ئەوەدا، ئەگەر بێتو ژمارەی کاتژمێرەکان لە بەرچاو نەگیرێت (لە راستیدا ئەمەش هەڵەیە) بەمەش تێکڕای نمرەی قوتابی بە پێ ی دەقی ئاسایی بریتییە لە (77.75)، سەرنجی ئەوە دەدرێت، کەجیاوازی گەورە لەگەڵ تێکڕای کێشکراو هەیە .

**نموونه** ( 8.4 ) :- ئەمەش مووچەی مانگانەی (هەزار دینار) ی هەموو فەرمانبەرەکانی زانکۆی سەلاحەددین .

| داهاتی مانگانە | ژمارەی فەرمانبەران | جۆری کار |
|---|---|---|
| 2340 | 95 | کارگێری |
| 1800 | 180 | ئەکادیمیەکان |
| 850 | 253 | هونەری |
| 350 | 67 | خزمەتگوزاری |

**داواکاری** :- تێکڕای داهاتی مانگانەی فەرمانبەرانی زانکۆی سەلاحەددین هەژمار بکە ؟

**شیکار** :- دەتوانرێت تێکڕای داهاتی مانگانەی فەرمانبەرانی زانکۆی سەلاحەددین بەم جۆرە هەژمار دەکرێت:-

$$\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{n} w_i x_i}{\sum_{i=1}^{n} w_i} = \frac{(95\times 2340)+(180\times 1800)+(253\times 850)+(67\times 350)}{95+180+253+67}$$

$$= \frac{784800}{595} = 1318.9916$$

**ب- نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو بۆداتا ڕیزکراوەکان :-**

دەتوانرێت نێوەنجی کێشکراو بۆ داتا ڕیزکراوەکان لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە دەبێت:-

$$\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{m} w_i f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} w_i f_i} \qquad \cdots(4.5)$$

**نموونە** ( 9.4 ):- ئەمەی خوارەوە بریتییە لە دابەشکردنی دوویارەیی بەرهەمی ڕۆژانە بۆ کارگەی جگەرەی هەولێر، کەدابەشکراوە بەپێ ی ژمارەی کارگەو ژمارەی کاتژمێرەکانی کارکردن، بەپێ ی جۆری مەکینەکانی ئەو کۆمپانیایە بەم شێوەی خوارەوە :-

| تویژەکانی بەرهەم(بڕی بەرهەم بە تەن) | ژمارەی مەکینەکان | ژمارەی کاتژمێری کارکردن |
|---|---|---|
| 4- | 8 | 12 |
| 8- | 10 | 10 |
| 12- | 12 | 12 |
| 16- | 6 | 8 |
| 20-24 | 4 | 8 |

**داواکاری :-** نێوەنجی بەرهەمداری هەر مەکینەیەکی ئەو کارگەیە هەژمار بکە ؟

**شیکار :-** بۆ هـەژمارکردنی نێـوەنجی بەرهەمـداری یـەك مەکینـە پێویسـتمان بەدروسـت کردنـی ئەوخشـتەیەدەبێت:- بۆیـە نێـوەنجی بەرهەمـداری یـەك مەکینـە بـەم شـێوەی خوارەوە دەبێت :-

| تویژەکان | ژمارەی مەکینەکا(دووبار مکان) $f_i$ | کاتژمێری کارکردن(کێشەکان) $w_i$ | سەنتەری تویژەکان $x_i$ | $w_i f_i$ | $w_i f_i x_i$ |
|---|---|---|---|---|---|
| 4- | 8 | 12 | 6 | 96 | 576 |
| 8- | 10 | 10 | 10 | 100 | 1000 |
| 12- | 12 | 12 | 14 | 144 | 2016 |
| 16- | 6 | 8 | 18 | 48 | 864 |
| 20-24 | 4 | 8 | 22 | 32 | 704 |
| سەرجەم | 40 | | | 420 | 5160 |

$$\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{m} w_i f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} w_i f_i} = \frac{\sum_{i=1}^{5} w_i f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} w_i f_i} = \frac{5160}{420} = 12.2857$$ تەن

**تێبینـی :-** سـەبارەت بەلایەنـە نێگـەتیڤ و پـۆزەتیڤ وخەسـڵەتەکانی نێـوەنجی هـەژمارکردنی کێشـکراو، بەتـەواوەتی هاوشـێوەی نێـوەنجی هـەژمارکردنی ئاسـاییە.

## 4.4: نێوەنجی هاوکۆکی :-Harmonic Mean

نێوەنجی هاوکۆکی لە هەژمارکردنی تێکڕای نرخی ئـالووێری بیـانی لەبەرامبـەر دراوە بیانییـەکانی دیکـە بـەکار دەهێنرێـت، یـان لەدۆزینـەوەی نێـوەنجی تێکـڕای زەمەنـە جیاجیاکانی وەك (ژمارەی یەکەکانی بەرهەمهێنراو لەکارگەیـەکی دیـاریکراو لەماوەیـەکی دیاریکراودا)، یان (لەدۆزینەوەی ناوەندی خوێندنەوەی کۆمـەڵێك لەکەسـەکان بەبەڵگـەی ژمـارەی وشـەکان لـە خولەکێکـدا بـەکاردەهێنرێت) ...هتـد، دەتوانرێـت لـەدۆخی داتـا نامبەوەبەکان و داتا مبەوەبەکان بەکاربهێنرێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

### أ- نێوەنجی هاوکۆکی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان :-

ئەمەش بریتییە لەسەراوژێری نێوەنجی هەژمارکردن بۆ سەراوژێری بەهاکانی دەقی گشتی بریتییە لە :-

$$H = \frac{n}{\sum_{i=1}^{n} \frac{1}{x_i}} \qquad \cdots \quad (4.6)$$

**تێبینی :-** بەهای بینەرەکان ($x_i$) پێویستە یەکسان نەبێت بەسفر

**نموونە** ( 10.4 ) :- نێوەنجی هاوکۆکی بۆ ئەم داتایانەی خوارەوە بدۆزەرەوە :-

| x | 4 | 5 | 3 | 4 | 7 | 8 | 5 | 10 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

**شیکار :-**

یەکەم جار سەراوژێری بەهاکان بدۆزەرەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

$$\frac{1}{x_i} = 0.25 \quad 0.2 \quad 0.33 \quad 0.25 \quad 0.14 \quad 0.13 \quad 0.2 \quad 0.1$$

ئەوا نێوەنجی هاوکۆکی بەم شێوەیە دەبێت :-

$$\therefore H = \frac{n}{\sum_{i=1}^{n} \frac{1}{x_i}} = \frac{8}{\sum_{i=1}^{8} \frac{1}{x_i}} = \frac{8}{0.25 + 0.2 + \ldots + 0.1} = \frac{8}{1.6} = 5$$

### ب- نێوەنجی هاوکۆکی بۆ داتا ڕیزکراوەکان :-

دەتوانرێت نێوەنجی هاوکۆکی بۆ داتا ڕیزکراوەکان کەتوێژ یان یەکسانە یان یەکسان نییە هەژمار بکرێت، ئەویش بەپێ ی ئەم دەقەی خوارەوە :-

$$H = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i}{\sum_{i=1}^{m} \frac{f_i}{x_i}} \qquad \cdots \quad (4.7)$$

**نموونە** ( 11.4 ) :- نێوەنجی هاوکۆکی بۆ دابەشکردنی دووبارەیی بەم شێوەی خوارەوە بدۆزەرەوە:-

| توێژەکان | دووبارەکان |
|---|---|
| 50- | 16 |
| 60- | 20 |
| 70- | 24 |
| 80- | 12 |
| 90- | 8 |
| 100-110 | 6 |

بۆ هەژمارکردنی نێوەنجی هاوکۆکی دەتوانرێت خشتە بەم شێوەیە دروست بکرێت :–

| توێژەکان | $x_i$ سەنتەری توێژەکان | $f_i$ دووبارەکان | $\frac{f_i}{x_i}$ |
|---|---|---|---|
| 50- | 55 | 13 | 0.2364 |
| 60- | 65 | 18 | 0.2769 |
| 70- | 75 | 25 | 0.3333 |
| 80- | 85 | 12 | 0.1412 |
| 90- | 95 | 7 | 0.0737 |
| 100-110 | 105 | 5 | 0.0476 |
| سەرجەم | | 80 | 1.1091 |

لەمیانەی ئەم خشتەیەدا دەتوانرێت نێوەنجی هاوکۆکی بەم شێوەیە هەژماربکرێت :–

$$H = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i}{\sum_{i=1}^{m} \frac{f_i}{x_i}} = \frac{\sum_{i=1}^{6} f_i}{\sum_{i=1}^{6} \frac{f_i}{x_i}} = \frac{80}{1.1091} = 72.1306$$

## لایەنی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی نێوەنجی هاوکۆکی :–

ئەمەی خوارەوە بریتییە لە گرنگترین لایەنە نێگەتیڤ و پۆزەتیڤەکانی نێوەنجی هاوکۆکی :–

## أ- لایەنە پۆزەتیڤەکان :–

پێـوەری نێـوەنجی هـاوکۆکی بەژمارەیـەك لایـەنی پـۆزەتیڤ دەناسـرێتەوە، لەوانـە:-
1- بیرۆکەی سادەیە .
2- هــــــەموو داتاکـــــان لــــــەکاتی هــــــەژمارکردن لەبەرچــــاو دەگرێــــت .
3- دەتوانرێـــــت هـــــەژماربکرێت بەپشـــــت بەســـــتن بـــــەکردەکانی جـــــەبری .

## ب- لایەنە نێگەتیڤەکان :-

خەوشــــــــەکانی نێــــــــوەنجی هـــــــــاوکۆکی بریتییــــــــــە لــــــــــە

1- تۆزێــــــــــك قورســـــــــــی لـــــــــــە هـــــــــــەژمارکردنی هەیـــــــــە .
2- ناتوانرێـت هـەژماری داتـا باسـەنییەکانی پـێ بکرێـت، کـە قـابیلی ڕێکخسـتن نـین .
3- ناتوانرێت هەژماربکرێت ئەگەر بەهای بزر بووی تێدابوو، تـەنیا دوای مەزنـدە کردنـی نەبێت .
4- زۆرکارێگار دەبێت بەداتا شازەکان و لایەنی شازەکانەوە.
5- ناتوانرێت هەژماربکرێت، کاتێك یەکێك لەبەهای داتاکـان یەکسـان بێـت بەسـفر، یـان سەنتەری توێژەکەی یەکسان بێت بەسفر .

## 5.4 :- نێوەنجی دووجا :-Quadratic Mean

دەتوانرێت لە هەردوو دۆخی داتا نا ڕیزکراوەکان و دۆخی داتا ریزکراوەکان بەم شێوەیە بدۆزەرەوە :-

## ا- نێـــــوەنجی دووجـــــا بـــــۆ داتـــــا نـــــا ڕیزکراوەکـــــان :-

نێوەنجی دووجـای بـۆ داتـا نـا ڕیزکراوەکـان بریتیـە لـەڕەگی دووجـای کـۆ بـۆ نێـوەنجی دووجای بەهای بینەران، واتە:-

$$Q = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} x_i^2}{n}} \qquad \cdots \quad (4.8)$$

**نموونە** ( 12.4 ) :- نێوەنجی دووجای پلەی گەرمای شاری هەولێر لە وەرزی زسـتان بـۆ ماوەی حەوت ڕۆژی لەدوایەك بدۆزەرەوە:-

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $x_i$ | 4 | 5 | 3 | -2 | -1 | 0 | 1 |

**شیكار :-**

$$Q=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}x_i^2}{n}}=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{7}x_i^2}{7}}=\sqrt{\frac{4^2+5^2+\cdots+1^2}{7}}$$

$$=\sqrt{\frac{56}{7}}=\sqrt{8}=2.8284$$

واتــه نێـوەنجی دووجـای پلــەی گــەرمای شــاری هــەولێر بـۆ ئـەو ماوەیـە بریتییـە لـە (2.8284) پلەی سەدی .

**ب- نێوەنجی دووجای بۆ داتا ڕیزكراوەكان :-**

دەتوانرێت نێوەنجی دووجای بۆ داتا ڕیزكراوەكان لەمیانەی ئەم دەقە بخەینە ڕوو:-

$$Q=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{m}f_i x_i^2}{\sum_{i=1}^{m}f_i}} \qquad \cdots \quad (4.9)$$

نموونە (13.4) :- نێوەنجی دووجا بۆ خشتەی دووبارەیی بەم شێوەیە :-

| دووبارەكان $f_i$ | توێژەكان |
|---|---|
| 5 | 10- |
| 6 | 20- |
| 8 | 30- |
| 7 | 40- |
| 4 | 50-60 |

**شیكار :-** بۆ دۆزینەوەی نێوەنجی دووجا دەتوانرێت ئەم خشتەیە دروست بكرێت :-

| $f_i x_i^2$ | $f_i$ دووبارەکان | $x_i^2$ | سەنتەری $x_i$ توێژەکان | توێژەکان |
|---|---|---|---|---|
| 1125 | 5 | 225 | 15 | 10- |
| 3750 | 6 | 625 | 25 | 20- |
| 9800 | 8 | 1225 | 35 | 30- |
| 14175 | 7 | 2025 | 45 | 40- |
| 12100 | 4 | 3025 | 55 | 50-60 |
| 40950 | 30 | | | سەرجەم |

بۆیە نێوەنجی دووجا بریتییە لە :-

$$Q = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i^2}{\sum_{i=1}^{m} f_i}} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{5} f_i x_i^2}{\sum_{i=1}^{5} f_i}}$$

$$= \sqrt{\frac{40950}{30}} = \sqrt{1365} = 36.9459$$

**تێبینی** :-لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی بەتەواوەتی هاوەشێوەی نێوەنجی هاوکۆکیە تەنیا ئەوە نەبێت دەتوانرێت هەژمار بکرێت، ئەگەر بەهای بینەرانی سفر بێت.

## 6.4 :- نێوەنجی ئەندازەیی :- Geometric Mean

نێوەنجی ئەندازەیی بۆ لێکۆڵینەوەی دانیشتوان زۆر گرنگە، بەتایبەتی کاتێک هەژماری تێکڕای گەشەکردنی دانیشتوان دەکرێت، هەروەها لە پێکهێنانی ژمارە پێوانەییەکانەوە، دەتوانرێت لەدۆخی داتا ڕیزکراوەکان هەژمار بکرێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

### أ- نێوەنجی ئەندازەیی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان :-

بەوە پێناسە دەکرێت، بریتییە لە ڕەگی موجەبی ڕیزبەندی (n) بۆ جارانی پێوانەی کۆمەڵەی بینەران بەیەکترییەوە، واتە:-

$$G=\sqrt[n]{\prod_{i=1}^{n} x_i}=\left(\prod_{i=1}^{n} x_i\right)^{\frac{1}{n}} \qquad \cdots \quad (4.10)$$

دەتوانرێت بەڕێگایەکی دیکەش بدۆزرێتەوە، ئەویش لەمیانەی وەرگرتنی لۆگاریتم لە سەر بنچینەی (10) بەم شێوەی خوارەوە :-

$$Log_{10}G = Log_{10}\left(\prod_{i=1}^{n} x_i\right)^{\frac{1}{n}}$$

$$=\frac{1}{n}\sum_{i=1}^{n} Log_{10}x_i$$

بەمەش ئەوا:

$$G = anti - Log_{10}\left(\frac{1}{n}\sum_{i=1}^{n} Log_{10}x_i\right)$$

**نموونە** :-( 14.4 ) :- نێوەنجی ئەندازەیی بۆ ئەم داتایانە بدۆزەرەوە :-

| $x_i$ | 5 | 10 | 15 | 20 | 25 |
|---|---|---|---|---|---|

**شیکار** :-

$$G=\sqrt[n]{\prod_{i=1}^{n} x_i}=\left(\prod_{i=1}^{n} x_i\right)^{\frac{1}{n}}$$

$$\therefore G=\sqrt[5]{5\times 10\times \ldots \times 25}=\sqrt[5]{375000}$$

$$=(375000)^{\frac{1}{5}}=13.0259$$

یان شیکار بەڕێگایەکی دیکە :-

$$G = anti - Log_{10}\left(\frac{1}{n}\sum_{i=1}^{n} Log_{10} x_i\right)$$

$$= anti - Log_{10}\left(\frac{1}{5}\left(Log_{10}(5) + Log_{10}(10) + \ldots + Log_{10}(25)\right)\right)$$

$$= anti - Log_{10}\left(\frac{1}{5}(0.699 + 1 + \ldots + 1.3979)\right)$$

$$= anti - Log_{10}\left(\frac{1}{5}(5.574)\right)$$

$$= anti - Log_{10}(1.1148) = 13.0259$$

**ب- نێوەنجی ئەندازەیی بۆ داتا ڕیزکراوەکان :-**

دەتوانرێت نێوەنجی داتا ڕیزکراوەکان لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت:-

$$G = \sqrt[\sum_{i=1}^{m} f_i]{\prod_{i=1}^{m} x_i^{f_i}} = \left(\prod_{i=1}^{m} x_i^{f_i}\right)^{\frac{1}{n}}; \quad n = \sum_{i=1}^{m} f_i \quad \cdots \quad (4.12)$$

هەروەها دەتوانرێت بەڕێگایەکی دیکەش لە میانەی لۆگاریتمی بنچینەی (10) بەم شێوەیە دەربهێنرێت :-

$$\log_{10} G = \frac{1}{n}\log_{10}\left(\prod_{i=1}^{m} x_i^{f_i}\right) = \frac{1}{n}\sum_{i=1}^{m} f_i \log_{10} x_i$$

$$\therefore \quad G = anti - \log_{10}\left(\frac{1}{n}\sum_{i=1}^{m} f_i \log_{10} x_i\right) \quad \cdots \quad (4.13)$$

**نموونـــه** ( 15.4 ) :- نێـــوەنجی ئەنـــدازەیی بـــۆ ئـــەم خشـــتە دووبـــارەیی خـــوارەوە بدۆزەرەوە:-

| دووبارە $f_i$ | توێژەكان |
|---|---|
| 2 | 0- |
| 4 | 10- |
| 5 | 20- |
| 6 | 30- |
| 3 | 40-50 |

**شیكار** :- بۆ دۆزینەوەی نێوەنجی ئەندازەیی بۆ داتا مبەوەبەكان ئەم خشتەیە دروست دەكەین :-

| $f_i \log_{10} x_i$ | $\log_{10} x_i$ | دووبارە $f_i$ | سەنتەری توێژەكان $x_i$ | توێژەكان |
|---|---|---|---|---|
| 1.3980 | 0.699 | 2 | 5 | 0- |
| 4.7044 | 1.1761 | 4 | 15 | 10- |
| 6.9895 | 1.3979 | 5 | 25 | 20- |
| 9.2646 | 1.5441 | 6 | 35 | 30- |
| 4.9596 | 1.6532 | 3 | 45 | 40-50 |
| 27.3161 | 40950 | 20 | | المجموع |

بۆیە نێوەنجی ئەندازەیی بریتییە لە :-

$$G = anti - \log_{10}\left(\frac{1}{n}\sum_{i=1}^{m} f_i \log_{10} x_i\right)$$

$$= anti - \log_{10}\left(\frac{1}{20}\sum_{i=1}^{5} f_i \log_{10} x_i\right)$$

$$= anti - \log_{10}\left(\frac{27.3161}{20}\right) = anti - \log_{10}(1.3658)$$

$$\therefore \quad G = 23.2167$$

**تێبینی** :- دەتوانرێت نێوەنجی ئەندازەیی بدۆزرێتەوە، کاتێك درێژی توێژەکان یەکسان بێت، هەتا ئەگەر یەکسانیش نەبن، سەبارەت بەلایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانەوە، ئەوا بەتەواوەتی هاوشێوەی نێوەنجی هاوکۆکییە، تەنیا ئەوە نەبێت ناتوانرێت هەژمار بکرێت کاتێك بەهای لەبینراوەکان بە سالیب بێت .

## 7.4 :- بەها زۆر دووبارەبووەکان : ( The Mode )

مەنوال بریتییە لەو بەهایەیی، کەزۆر لە بینراوەکانی تر دووبارەدەبێتەوە، یان ئەو سیفەتەی کە زۆر بلاوە، بۆیە وا باشە کاتێك داواکاری زانینی ئارەزووی بەکاربەر لەبارەی کالایەکی دیاریکراو بزانرێت پەنا بۆ ئەم پێوەرە ببرێت، هەروەها دەتوانرێت لەدۆخی داتا ریزکراوەکان و نا ریزکراوەکان بەدەست بهێنرێت ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

**أ- مەنوال بۆداتا نا ریزکراوەکان** :- مەنوال بریتییە لەو بەهایەیی کە زۆر دووبارە دەبێتەوە لەنێوکۆمەڵە داتایەکی بژاردەدا، ئینجا ئەگەر بێتو بەهای چەندبارەکان بەهەمان ژمارەی دووبارەکان بێت، ئەوا لەم دۆخەدا مەنوال نییە، لەبەرامبەردا یەك مەنوال یان زیاترە لەیەك مەنوالمان لەداتای بژاردەیەك دەبێت، ئەویش ئەگەر بێتو چەند بارەیەك بۆ یەك بەها یان زیاتر بەهەمان ژمارەی دووبارەکان هەبێت.

نموونە (16.4) پیشانگای شیشار بۆ ئۆتۆمبێل فرۆشتنەکانی لە ئۆتۆمبیلی فۆرد لەماوەی ڕابردوو بەپێ ی ئەو ڕەنگانەی خوارەوە بووە:-

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| **زەرد** | **سپی** | **رەش** | **سپی** | **سوور** |
| **سەوز** | **سپی** | **سوور** | **رەش** | **سپی** |

**داواکاری** :- زانینی مەنوال و چ ڕێنمایەك دەداتە ئەو کۆمپانیایە ؟

**شیکار** :- لەمیانەی فرۆشتنەکان سەرنجی ئەوە دەدرێت، کە ئۆتۆمۆبیلی سپی زۆرترین چەندبارەی هەبووە (چوار جار دووبارە بۆتەوە) بەبەراورد بەڕەنگەکانی دیکە، بۆیە مەنوال بریتییە لە ئۆتۆمۆبیلی ڕەنگ سپی و ڕینمایی دەداتە ئەو کۆمپانیایە، کەزیاتر ئۆتۆمۆبیلی ڕەنگ سپی بهێنێت، چونکە فرۆشتنی زیاترە.

**نموونە( 17.4 )** :- مەنوال بۆ ئەم داتایانەی خوارەوە بدۆزەرەوە:-

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $x_1$ | 5 | 4 | 3 | 5 | 2 | 6 | 5 | 3 | 7 | 4 | 5 |

**شيكار:-** لەميانەی ئەم داتايانەی خوارەوە سەرنج دەدەين كەمەنوال بريتييە لە (5) چونكە چوار جار دووبارە بۆتەوە بەبەراورد بەبەهاكانی تر.

**نموونە(18.4):-** مەنوالی ئەم داتايانەی خوارەوە بدۆزەرەوە:-

| $x_i$ | 1 | 2 | 3 | 5 | 7 | 10 |
|---|---|---|---|---|---|---|

**شيكار:-** مەنوال بۆئەم داتايانەی سەرەوە نييە، چونكە ژمارەی چەند جار بوونەوەی تێدا نييە.

## ب- مەنوال بۆ داتا ڕيزكراوەكان :-

چەند ڕێگايەك بۆ هەژماركردنی مەنوالی داتا ڕيزكراوەكان هەيە، ئەويش بەپێی جۆرەكانييەوە، لێرەدا ئاسانترين ڕێگا دەخەينە ڕوو، مەنوال بريتييە لەو بەهايەی كەنوينەرايەتی سەنتەری توێژی بەرامبەری گەورەترين دووبارەبوونەوە لەخشتەی دووبارەيی دەكات، لەبەرامبەردا ژمارەيەك ڕێگا هەيە، كە دەرفەت نييە لێرەدا بيخەينە ڕوو وەك ڕێگای بيرسۆن ...هتد.

نموونە(19.4):- مەنوالی خشتەی دووبارەيی بدۆزەرەوە:-

| $f_i$ دووبارە | توێژ |
|---|---|
| 1 | 0- |
| 3 | 10- |
| 7 | 20- |
| 5 | 30- |
| 2 | 40-50 |

**شيكار:-** لەميانەی ئەم خشتەی سەرەوە سەرنجی ئەوە دەدەين، كە گەورەترين دووبارەبوونەوە بريتييە لە (7)، كە بەرامبەر توێژی (20.30)، واتە مەنوال يەكسانە بەسەنتەری ئەوتوێژە، كەبريتييە لە(25)

**تێبينی:-** مەنوال بەئاسانی هەژماركردنييەوە ناسراوە، هەروەها بە بەهای شاز و لايەنە شازەكانەوە كارێگارنابێت، بێجگە لەمانە باشترين پێوەرە بۆداتاكانی جۆری باسەنی، بەلأم خەوشەكەی لەوەدايە، كە هەموو داتاكان لەكاتی هەژماركردن لەبەرچاو ناگرێت، هەروەها ناكەوێتە ژێر كارێگاريی ڕێسايەكی جەبری نەگۆڕ لە هەموودۆخەكانی هەژماركردندا.

## 8.4 :- ناوەڕاست :- The Median

ناوەڕاست بریتییە لەو بەهایەیی کە لە ڕیزبەندی کۆمەڵەکەی دەکەوێتە ناوەڕاستەوە، جا ئەو ڕیزبەندییە بەشێوەی بەرزبۆوە، یان نزم بۆوە بێت، دەتوانرێت لەدۆخی داتای ڕیزکراوەکان بەم شێوەی خوارەوە بدۆزرێتەوە:—

### أ- ناوەڕاستی داتا نا ڕیزکراوەکان :-

لەدۆخی داتا نا ڕیزکراوەکان، ئەگەربێتو ژمارەی بەهای (n) ژمارەی تاك بێت، ئەوکاتە بەهای (X) دوای ڕیزبەندی، کەزنجیرەکەی بریتییە لە$\left(\frac{n+1}{2}\right)$ بەڵام ئەگەر بێتو بەهای (n) ژمارەی جووت بێت، ئەو کاتە بەهای ناوەڕاست بریتی دەبێت لەناوەندی هەژمارەیی بۆهەردوو بەهای (X) و دوای ڕیزبەندی کردنییان، کە بریتییە لە ( $\frac{n}{2}$ ) و ( $\frac{n}{2}+1$ )

**نموونە**( 20.4 ): ناوەڕاستی نمرەی (9) قوتابی لەتاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو بدۆزەرەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:—

| x | 55 | 62 | 53 | 70 | 68 | 65 | 63 | 79 | 80 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

بریتییە لەژمارەی تاك، بۆیە ڕیزبەندی پێویست بریتییە لە :—

**شیکار :-** بەهۆی ئەوەی ژمارەی بینەرەکان( بۆیە: $5=\frac{9+1}{2}=\frac{n+1}{2}$

| ڕیزبەندی بەرزبۆوە | 80 | 79 | 70 | 68 | 65 | 63 | 62 | 55 | 53 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زنجیرە | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |

واتە ڕیزبەندی بەهای پێنجەم بریتییە لەناوەڕاست واتە نمرەی (65).

**نموونە**( 21.4 ) لەم کۆمەڵەیە ناوەڕاستی تەمەنی تاکەکان بدۆزەرەوە:—

| x | 20 | 22 | 19.5 | 26 | 24.5 | 27 | 28 | 29 | 18 | 20 | 23 | 25 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

**شیکار:-** ئەم بەهایانە بەشێوەی بەرزبۆوە ڕیزبەندی بکە:—

| ڕیزبەندی بەرزبۆوە | 29 | 28 | 27 | 26 | 25 | 24.5 | 23 | 22 | 20 | 20 | 19.5 | 18 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زنجیرە | 12 | 11 | 10 | 9 | 8 | 7 | 6 | 5 | 4 | 3 | 2 | 1 |

بەهۆی ئەوەی(n) بریتییە لە: ( $\frac{n}{2}$ و $\frac{n}{2}+1$) واتە ( $\frac{12}{2}$ و $\frac{12}{2}+1$) واتـە(6) و (7) کەبەهای ( 23) و (24.5) دیار دەکەن، بۆیە ناوەڕاست بریتییە لە تێکڕای هەردووکییان، واتە:—

$$me = \frac{23 + 24.5}{2} = 23.75$$ ساڵ

## ب- ناوەڕاستی داتا ڕیزکراوەکان :-

دەتوانرێت ناوەڕاست بۆ داتا ڕیزکراوەکان لەمیانەی دابەشکردنی دووبارەیی بەرز بـۆوە دەدۆزرێتەوە، هەروەها ریزبەندی ناوەڕاست بەهـەژمارکردنی نیـو دووبـارەیی هـەمووەکی دەدۆزرێتــەوە، دیــارکردنی توێــژی ناوەڕاســتیش، کەبەرامبــەر دووبــارەیی کــۆکراوەی بـەرزبۆوە، کـە لـەدوای ئـەوە ناوەڕاسـتی ڕاسـتەوخۆ دێـت، بـەم یاسـایەش دەتوانرێـت ناوەڕاست بدۆزرێتەوە :—

$$Me = L_i + \left[ \frac{n/2 - F_i}{f_i} \right] \cdot w \quad \cdots \quad (4.14)$$

کە:

بریتییە لە نزمترین ڕادە بۆ توێژی ناوەڕاست $L_i$.

بریتییە لە دووبارەیی توێژی ناوەڕاست $f_i$

بریتییە لە دووبارەیی کۆکراوەیی بەرزبۆەی پێشوو بۆ توێژی ناوەڕاست $F_i$

بریتییە لە دریژی توێژی ناوەڕاست کەم یەك ئەگەر بێتـو گۆڕاوەکـە لـە جـۆری پچـر پچر بوو.W

بـەڵام بـۆ خشـتەی دابەشـکردنی دووبـارەیی نزمبـۆوە ئـەم یاسـایەیی خـوارەوە بەکاردەهێنین :

$$Me = L_i + \left[ \frac{F_i' - n/2}{f_i} \right] \cdot w \quad \cdots \quad (4.15)$$

کە: $F_i'$ بریتییە لە دووبارەیی نزمبۆوە، کە بەرامبەر توێژی ناوەراستە.

**نموونە(22.4)** ناوەڕاست بۆ خشتەی دابەشبوونی دووبارەیی بدۆزەرەوە، ئەویش لەنموونەی (4.2)، کە لە میانەیدا ئەمانەمان هاتەدەست:-

| دووبارەیی کۆکراوەی $F_i$ بەرزبۆوە | $f_i$ ادووبارە (ژمارەی کرێکار) | سنووری بەرزی توێژەکان | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|---|
| 5 | 5 | 30 | 1 |
| 17 | 12 | 34 | 2 |
| 28 | 11 | 38 | 3 |
| 37 | 9 | 42 | 4 |
| 42 | 5 | 46 | 5 |
| 45 | 3 | 50 | 6 |

**شیکار**:- ڕیزبەندی ناوەڕاست بریتییە لە(45) لەسەر(2) یەکسانەبە(22.5)، کەدەکەوێتە نێوان(17و28)، کەبەرامبەر توێژی ناوەڕاستی(38.34) واتە:-

$$Me = L_i + \left[\frac{n/2 - F_i}{f_i}\right] \cdot w$$

$$= 34 + \left[\frac{22.5 - 17}{11}\right] \cdot 3 = 35.5$$

بەبەکارهێنانی کۆکراوەی دووبارەیی نزم بۆوە:-

| دووبارەیی کۆکراوەی $F_i'$ نزمبۆوە | $f_i$ دووبارە (ژمارەی کرێکار) | سنووری نزمی توێژەکان | زنجیرەی توێژ |
|---|---|---|---|
| 45 | 5 | 26 | 1 |
| 40 | 12 | 30 | 2 |
| 28 | 11 | 34 | 3 |
| 17 | 9 | 38 | 4 |
| 8 | 5 | 42 | 5 |
| 3 | 3 | 46 | 6 |

$$Me = L_i + \left[\frac{n/2 - F_i'}{f_i}\right] \cdot w$$

$$= 34 + \left[\frac{28 - 22.5}{11}\right] \cdot 3 = 35.5$$

هەروەها دەتوانرێت بەهای ناوەڕاست لەمیانەی خاڵی یەکتر بڕینی دووبارەیی بەرزبۆوەو دووبارەیی نزم بۆوە دیاربکرێت، کەبەرامبەر(35.5) هەروەکو لەم هێڵکاریەیی خوارەوە بەرچاو دەکەوێت :ـ




**شێوەی( 4.1 ): چەماوەی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە و نزمبۆوە بۆ 45 کرێکار بە پێی کرێ ڕۆژانە لەگەڵ دیارکردنی بەهای ناوەڕاست**

<u>**تێبینی(1 )**</u> :- ناوەڕاست بەوە دەناسرێتەوە، کە کارێگاری نابێت بە بەهای شاز، دەتوانرێت بۆبەهای باسەنی بدۆزرێتەوە، و قابیلی ڕیزبەندییە، بەلام خەوشەکەی ئەوەیە

هـەموو بـەهاکان لـەکاتی هـەژمارکردن لەبەرچـاوناگرێت، هـەروەها جۆرێـك لەقورسـیش لەهەژمارکردنی دا هەیە.

**تێبینی**( 2 ) :- ئەگەر بێتو دابەشکردنی هاوشێوە بێت(پەیڕەوی دابەش کردنی سروشـتی بێـت) ئـەوا نێـوەنجی هـەژمارکردن ومـەنوال و ناوەڕاسـت یەکسـان دەبـن، هـەرکاتێکیش لەدابەشکردنی هاوشێوەیی لێك دوور دەبن، ئەوا بەهاکانیان لێك دوور دەبێت.

# ڕاهێنانی بەشی چوارەم

**4.1**: مەبەست لەپێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی چییە ؟

**4.2**:-نێوەنجی هەژمارکردنی داهاتی مانگانەی بژاردەیەکی وەرگیراو لەکۆمەڵگای هەولێر بەم شێوەیە بدۆزەرەوە :-

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 400 | 700 | 800 | 1000 | 900 | 200 | 500 | 650 | 950 | 740 | 520 |

**4.3**:- تێکڕای پلەی گەرمای شاری هەولێر لەماوەی ساڵێکدا هەژماربکە ؟.

| | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 30 | 40 | 45 | 48 | 35 | 30 | 28 | 20 | 18 | 12 | 10 | 5 |

**4.4**:- ئەگەر بێتو بەکاربردنی مانگانەی خێزان لەشەکر لەشاری هەولێر و سلێمانی بەم شێوەیە بێت :-

| | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 12 | 15 | 12.4 | 13.9 | 10.3 | 9.06 | 2.70 | 5.9 | 6.5 | 7.50 | 7.8 | هەولێر |
| 9.8 | 10 | 5.9 | 6.8 | 4.8 | 7.9 | 5.8 | 12 | 13 | 4.9 | 3.4 | سلێمانی |

**داواکاری** :- ئایا تێکڕای بەکاربردنی خێزانی مانگانە بۆ شەکر لە هەولێر کەمترە لەسلێمانی ؟

**5.4**:- ئەم داتایانەی خوارەوە بڕی پارە بەدینار دیار دەکات، کە(45) نوێنەری فرۆشتن لە یەکێك لە هەفتەکان بە دەستی دەهێنن :-

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 29 | 38 | 37 | 35 | 30 | 26 | 41 | 37 | 34 |
| 30 | 44 | 42 | 37 | 33 | 31 | 27 | 40 | 38 |
| 32 | 28 | 49 | 40 | 39 | 34 | 30 | 39 | 35 |
| 39 | 31 | 33 | 26 | 44 | 31 | 31 | 46 | 43 |
| 38 | 35 | 35 | 32 | 45 | 36 | 32 | 34 | 48 |

**داواکاری** :-

1- ئەو داتایانە لە خشتەی دابەشکردنی دووبارەیی دابنێ .

2- نێوەنجی هەژمارکردنی داتا ڕیزکراوەکان ژماربکە .

**6.4:–** نێوەنجی کرێ بۆ خشتەی دووبارەیی لە نموونەی (1.2) هەژماربکە :–

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان (کرێ) | دووبارەکان $f_i$ (ژمارەی کرێکار) |
|---|---|---|
| 1 | 29-26 | 5 |
| 2 | 33-30 | 12 |
| 3 | 37-34 | 11 |
| 4 | 41-38 | 9 |
| 5 | 45-42 | 5 |
| 6 | 49-46 | 3 |

**7.4:–** کارگەیەك لەسێ بەش پێکهاتووە، هەر بەشەو تایبەتمەندە بەبەرهەمهێنانی کاڵایەکی دیاریکراو، ژمارەی کرێکاران و نێوەنجی کرێ ی مانگانە (بەهەزار دینار ) بۆ هەر بەشێك بەم شێوەی خوارەوەیە :–

| ژمارەی کرێکاران | 95 | 80 | 106 |
|---|---|---|---|
| نێوەنجی کرێ | 110 | 107 | 99 |

**داواکاری** :– نێوەنجی کرێ ی مانگانەی کرێکار لەو کارگەیە هەژمار بکە؟

**8.4:–** نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو بۆ ئەو کۆمەڵە داتایانەی خوارەوە بدۆزەرەوە:–

أ–

| $x_i$ | 10 | 18 | 15 | 11 | 19 | 22 | 20 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $w_i$ | 1 | 4 | 3 | 2 | 5 | 7 | 6 |

ب–

| $x_i$ | -1 | 0 | 2 | -2 | -3 | 1 | -4 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $w_i$ | 2 | 4 | 3 | 5 | 3 | 2 | 2 |

**9.4:-** نێــوەنجی هــەژمارکردنی کێشــکراو بــۆ خشــتەی دابەشــکردنی دووبــارەیی بدۆزەرەوە:-

| سەنتەری توێژەکان | دووبارەکان | کێشەکان |
|---|---|---|
| 10 | 16 | 24 |
| 20 | 20 | 20 |
| 30 | 24 | 22 |
| 40 | 12 | 10 |
| 50 | 8 | 6 |
| 60 | 6 | 8 |

**10.4:-** نێــوەنجی هــاوکۆکی و دووجــایی بــۆ کۆمەڵەیــەکی داتایانــەی خــوارەوە بدۆزەرەوە:-

أ-

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 17 | 15 | 19 | 25 | 20 | 16 | 18 | 12 | 14 | 10 |

ب-

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 2 | -3 | -4 | 5 | -2 | 3 | 1 | -2 | -3 | -4 |

ج-

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 0.7 | 0.6 | 0.8 | 0.4 | 0.1 | 0.3 | 0.5 | 0.2 |

**11.4:-** نێوەنجی هاوکۆکی و دووجایی ئەندازەیی بۆ خشتەی دابەشکردنی دووبارەیی بەم شێوەی خوارەوە بدۆزەرەوە:-

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان | دووبارەکان |
|---|---|---|
| 1 | 5-10 | 4 |
| 2 | 10-15 | 10 |
| 3 | 15-20 | 13 |
| 4 | 20-25 | 8 |
| 5 | 25-30 | 5 |

(12.4):- نێـوەنجی ئەنـدازەیی بـۆنرخی لترێـك بـەنزین لەهـەموو شـارەکانی هـەرێمی کوردستان بدۆزەرەوە:-

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| **هەولێر** | 600 | 620 | 650 | 650 | 700 | 720 |
| **سلێمانی** | 650 | 680 | 700 | 720 | 750 | 750 |
| **دهۆك** | 580 | 600 | 590 | 650 | 680 | 700 |

13.4:- بۆ ئەم کۆمەڵە داتایانەی خوارەوە مەنوال بدۆزەرەوە:-

| | | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| A | 4 | 6 | 8 | 6 | 7 | 5 | 5 | 7 | 6 | 6 | 7 | 8 | 6 | 9 | 6 |

| | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| B | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 |

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| C | 2.5 | 3.5 | 3.25 | 3.3 | 2.52 | 3.4 | 3.29 | 3.6 | 2.5 | 3.4 |

14.4:- ئەمەی خوارەوە هەڵسەنگاندنی قوتابیانی بەشی ئابوورییە داواکاری مەنوال بدۆزەرەوە.:

| کەوتوو | پەسەند | ناوەند | باشە | زۆر باشە | نایاب |
|---|---|---|---|---|---|
| 10 | 30 | 35 | 40 | 25 | 12 |

15.4:- ناوەڕاست بۆ ئەم کۆمەڵەداتایانەی خوارەوە بدۆزەرەوە.

| | | | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| A | 2 | 7 | 9 | 3 | 10 | 12 | 22 | 4 | 7 | 8 | 20 | 19 | 18 | 17 | 5 | 21 |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| B | پەسەند | کەوتوو | زۆر باشە | ناوەند | باشە | نایاب | ناوەند | کەوتوو | نایاب |

16.4:- ناوەڕاست بۆئەم داتا مبەوەبانەی خوارەوە بدۆزەرەوە:-

| زنجیرەی توێژ | توێژەکان ( بڕی بەرهەمی گەنم بەتەن ) | دووبارەکان $f_i$ ( ژمارەی پارچە زەوی ) |
|---|---|---|
| 1 | 26.70-17.83 | 1 |
| 2 | 35.56-26.70 | 14 |
| 3 | 44.42-35.56 | 20 |
| 4 | 53.28-44.42 | 8 |
| 5 | 62.15-53.28 | 7 |
| 6 | 71.02-62.15 | 6 |
| 7 | 79.88-71.02 | 4 |

## 1.5:- پێشەکی :-

پێوەری ناکۆکی ناوەندی، بەتەنیا ناتوانێت بیرۆکەیەکی ڕوون و ئاشکراو تەواو لەبارەی کۆمەڵێك داتا بداتە دەستەوە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیدارە بەبڕی هاوشێوەیی پێکهاتەی کۆمەڵەیەك، بەبەراورد بەکۆمەڵەیەکی تر لەداتای هەمان دیاردە، بۆیە پێوانەی پەرشو بڵاوی دەخوێنین کەبیرۆکەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆ باشی ناوەندەکان دەداتە دەست بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی پێکهاتەکان بکات، ئینجا ئەگەر بێتو ئەنجامی ئەو پێوەرە گەورە بوو، ئەوا لێك دووری لەنێوان بەهای ئەو کۆمەڵەیە بەرفراوانە، بۆیە ناتوانرێت پشت بەناوەندەکان ببەسترێت لەنوێنەرایەتی کردنی پێکهاتەکانییەوە، بەڵام ئەگەر بێتو ئەنجامەکە بچووك بوو، ئەوا بەهاکان لێك نزیکن، هەروەها لەسەنتەر نزیك دەبن، بۆیە ئەوکاتە دەتوانرێت پشت بەناوەندەکان سەبارەت بەکۆمەڵەکانی کەپێکهاتەیان نزیکە لە ناوەند ببەسترێت .

## 2.5:- مەودا :-Range

مەودا سادەترین جۆری پێوەرەکانی پەرشو بڵاوییە، کەدەتوانرێت هەژمار بکرێت لەدۆخی داتا ڕیزکراوەکان و داتا نا ڕیزکراوەکان، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

### أ- مەودا بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان :

بەوە پێناسە دەکرێت، کە بریتییە لەجیاوازی نێوان گەورەترین و بچوکترین بەها لە کۆمەڵە داتایەك، ئەگەر بێتو $(x_1, x_2, \ldots\ldots, x_n)$ بریتی بێت لەپێوانەی بژاردەیەك، کەقەبارەکەی (n) بێت و بریتی بێت لە گەورەترین بەهاو $(x_S)$ و $(x_l)$ بریتی بێت لەبچوکترین بەها، ئەوکاتە مەودای ئەو کۆمەڵەیە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت .

$$R = x_l - x_s \qquad \cdots \quad (5.1)$$

**نموونە( 1.5 ) :-** گریمان ئەم داتایانەی خوارەوەت هەیە، کە بریتییە لەبژاردەی نمرەی (8) قوتابی لەوانەی ئابووری، داواکاری مەودای نمرەی قوتابیان بدۆزەرەوە:-

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $x_i$ | 65 | 66 | 90 | 56 | 75 | 43 | 78 | 25 |

**شیکار :-** گەورەترین و بچوکترین نمرە بەم شێوەی خوارەوەیە:-

$$x_l = 90 \qquad and \qquad x_s = 25$$

بۆیە مەودا بریتی یە لە:—

$$R = x_l - x_s = 90 - 25 = 65$$

**ب- مەودا بۆ داتا ڕیزکراوەکان:-**

دەتوانرێت مەودا بۆ داتا ڕیزکراوەکان لەمیانەی هەژمارکردنی جیاوازی نێوان سەنتەری توێژی بالاٌو سەنتەری توێژی نزم بدۆزرێتەوە یان هەژمارکردنی جیاوازی نێوان بەرزترین ڕادەی توێژو نزمترین ڕادەی توێژ دەبێت .

**نموونە(2.5):-** کارگەی بیشار لەهەولێر بۆ بەرهەمهێنانی بسکویت (60) کرێکار لەخۆدەگرێت لەگەلٚ بەرهەمی ڕۆژانەی ئەو کارگەیە، ئەویش لەمیانەی ئەم خشتەی خوارەوە:—

| 65–59 | 58–52 | 51–45 | 44–38 | 37–31 | 30–24 | توێژەکانی بەرهەم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 9 | 10 | 12 | 14 | 9 | 6 | ژمارەی کرێکار |

مەودای بەرهەمداری ڕۆژانەی کرێکار بدۆزەرەوە؟

**شیکار:-** دەتوانرێت مەودا هەژمار بکرێت لە میانەی هەژمارکردنی جیاوازی نێوان سەنتەری بەرزو نزم دەبێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:—

سەنتەری توێژی نزم بریتییە لە :—

$$\frac{30+24}{2} = 27$$

سەنتەری توێژی بەرز بریتییە لە:—

$$\frac{65+59}{2} = 62$$

کەواتە مەودا بریتییە لە:—

$$R = 62 - 27 = 35$$

یان بەکارهێنانی جیاوازی نێوان بەرزترین ڕادەی توێژی بالاٌو نزمترین ڕادەی توێژی بچووک، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:—

$$R = 65 - 24 = 41$$

**تێبینی :-** ئەو پێوەرە زۆر ئاسانە، لەبواری جۆراو جۆر بەکار دەهێنرێت، لە گرنگترینیان دروست کردنی دلٌنیایی جۆری یان کوالێتی کۆنترۆلە (Quality Control)، کە بەکار دەهێنرێت بۆ چاودێری جۆری بەرهەم، بەتایبەتی کاتێک قەبارەی بژاردە لە(10) کەمتر دەبێت، بەلاٌم زۆر پشتی پیٚ نابەسترێت لەپێوانەکردنی

پەرشوبڵاوی، ئەویش لە بەر ئەوەی تەنیا پشت بەدوو بەها یان ژمارە دەبەستێت و ژمارەکانی تر فەرامۆش دەکات، بۆیە زۆر بەبەهای لایەنی شازەکان کارێگار دەبێت، ئینجا بۆ ئەوەی زۆر سوودی هەبێت(5٪)، بەهای توندی بەرزو نزم فەرامۆش دەکرێت ئینجا هەژماری مەودا دەکرێت، ئەمەش کاردانەوەی باشی لەسەر سروشتی دابەش کردنی داتاکانی لەکۆمەڵگای توێژینەوە دەبێت.

## 3.5 :- لادانی نێوەنج: (Mean Deviation)

بریتییە لە نێوەنجی لادانی بەهای کۆمەڵەیەك لەنێوەنجی هەژمارکردن، کە یەکسان دەبێت بە سفر، بۆ دەربازبوون لەمەش بەهای ڕەها وەردەگیرێت بۆ فەرامۆش کردنی سالیب بۆ لادانەکان، دەتوانرێت لادانی نێوەنج لە دۆخی داتای نا ڕیزکراوەکان و دۆخی داتای ڕیزکراوەکان دەربهێنرێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

### أ- لادانی نێوەنج بۆ داتا ڕیزکراوەکان :-

دەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقە هەژمارکردن بکرێت :-

$$M.D = \frac{\sum_{i=1}^{n} |x_i - \bar{x}|}{n} \qquad \cdots \quad (5.2)$$

**نموونە(3.5) :** لەم داتایانەی خوارەوە لادانی نێوەنج بدۆزەرەوە؟

| $x_i$ | 3 | 4 | 2 | 6 | 5 |
|---|---|---|---|---|---|

**شیکار:-** ئەوا لادانی نێوەنج بریتییە لە:-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{5} x_i}{5} = \frac{3+4+2+6+5}{5} = 4$$

$$M.D = \frac{\sum_{i=1}^{n} |x_i - \bar{x}|}{n} = \frac{|3-4|+|4-4|+|2-4|+|6-4|+|5-4|}{5} = \frac{6}{5} = 1.2$$

### ب- لادانی نێوەنج بۆ داتا ڕیزکراوەکان :-

هەژمارکردنی لادانی نێوەنج بۆ داتا ڕیزکراوەکان لەمیانەی دۆزینەوەی سەنتەری توێژەکان و جاران کردنی بە دوو بارەکانی دەبێت، کە بەرامبەری هەژمارکردنی نێوەنجی هەژمارکردنی داتا ریزکراوەکانە، دوای ئەوە لادانی هەموو سەنتەرەکانی توێژ لەنێوەنجی هەژمارکردن دەدۆزرێتەوە، لەگەڵ فەرامۆش کردنی نیشانەکانی (+،=)، و جاران کردنی هەریەکێك لەوانە بەدووبارەکانی بەرامبەرییان ئینجا کۆدەکرێنەوەو دابەش دەکرێن بەسەر سەرجەمی دووبارەبووەکان، ئەویش بەپێ ی ئەم دەقەی خوارەوە:-

$$M.D = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i |x_i - \bar{x}|}{\sum_{i=1}^{m} f_i} \qquad \cdots \quad (5.3)$$

هەروەها ڕێگای دیکە بۆ هەژمارکردنی لادانی نێوەنج هەیە، ئەویش لەمیانەی لادانەکانی سەنتەری توێژەکان لەبارەی مەنوال یان ناوەڕاست لەجیاتی نێوەنجی هەژمارکردن .

**نموونە(4.5)** :- لەمیانەی نموونەی (2.5) بۆ خشتەی دابەشکردنی دووبارەیی خوارەوە لادانی نێوەنج بدۆزەرەوە:-

| 65-59 | 58-52 | 51-45 | 44-38 | 37-31 | 30-24 | توێژی بەرهەم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 9 | 10 | 12 | 14 | 9 | 6 | ژمارەی کرێکار |

**شیکار** :- دەتوانرێت نێوەنجی هەژمارکردن بۆداتا ڕیزکراوەکان بدۆزرێتەوە، دوای ئەوە لادانی نێوەنج لەمیانەی دروست کردنی ئەم خشتەیە بدۆزەرەوە:-

| $f_i\|x_i - \bar{x}\|$ | $\|x_i - \bar{x}\|$ | $f_i x_i$ | سەنتەری توێژەکان $x_i$ | ژمارەی کرێکار | توێژەکانی بەرهەم |
|---|---|---|---|---|---|
| 110.5998 | 18.4333 | 162 | 27 | 6 | 30-24 |
| 102.8997 | 11.4333 | 306 | 34 | 9 | 37-31 |
| 62.0662 | 4.4333 | 574 | 41 | 14 | 44-38 |
| 30.8004 | 2.5667 | 576 | 48 | 12 | 51-45 |
| 95.667 | 9.5667 | 550 | 55 | 10 | 58-52 |
| 149.1003 | 16.5667 | 558 | 62 | 9 | 65-59 |
| 551.1334 | | 2726 | | 60 | سەرجەم |

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} f_i} = \frac{2726}{60} = 45.4333$$

بۆیە لادانی نێوەنج بریتییە لە:-

$$M.D = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i |x_i - \bar{x}|}{\sum_{i=1}^{m} f_i} = \frac{551.1334}{60} = 9.1856$$

**تێبینی** :- ئەم پێوەرە لەمەودا وردترەو هەموو بەهاکان لەهەژمارکردن لەبەرچاودەگرێت، بەڵام زۆر بەبەها شازەکانی کاریگەرەو فەرامۆشکردنی نیشانەکانیش دەبێتە سنووردارێوونی وردییەکان.

## 4.5 :- لادانی چارەگی :- Quartile Deviation

یان پێ ی دەڵێن(نیوەی مەودای چارەگی)، کە گیروگرفتی کارێگار بەبەهای شاز چارەسەر دەکات، کەمەودا بەدەستییەوە دەناڵێنێت، دەتوانرێت لەدۆخی داتا ڕیزکراوەکان و داتا ڕیزکراوەکان بدۆزرێتەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

**أ- لادانی چارەگی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان** :- لادانی چارەگی لەمیانەی ڕیزبەندی داتاکان بەشێوەی بەرزبۆوەو نزم بۆوە دەدۆزرێتەوە، ئینجا هەژماری هەردوو چارەگی نزم و بەرز بەم شێوەیە ڕیزبەندی دەکرێت:-

ڕیزبەندی چارەگی نزم = $\frac{\text{ژمارەی بەهاکان} + 1}{4}$ ، ڕیزبەندی چارەگی بەرز = $\frac{(\text{ژمارەی بەهاکان} + 1) \times 3}{4}$

دەتوانرێت لادانی چارەگی لەمیانەی ئەم دەقە بدۆزرێتەوە:-

$$Q \cdot D = \frac{Q_u - Q_l}{2} \qquad \cdots \quad (5.4)$$

**نموونە**( 5.5 ) :- لەم داتایانەی خوارەوە، لادانی چارەگی بدۆزەرەوە؟

| $x_i$ | 4 | 3 | 2 | 6 | 5 | 2 | 3 | 5 | 1 | 0 | 4 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

**شیکار :-** بۆدۆزینـەوەی ریزبەنـدی چـارەگی نـزم و بـەرز، داتاکـان بەشـێوەی بـەرزبۆوە ریزبەندی دەکەیت:-

| $x_i$ | 0 | 1 | 2 | 2 | 3 | 3 | 4 | 4 | 5 | 5 | 6 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

ریزبەندی چارەگی بەرز= $\frac{1+11}{4} = 3$

ریزبەندی چارەگی نزم= $3 \times \left(\frac{1+11}{4}\right) = 9$

واتە: $Q_u = 5$ و $Q_l = 2$

دەتوانرێت هەژمارکردنی لادانی چارەگی بەم شێوەیە هەژماربکرێت :-

$$Q \cdot D = \frac{Q_u - Q_l}{2} = \frac{5-2}{2} = 1.5$$

## ب- لادانی چارەگی بۆ داتا ڕێزکراوەکان :-

لادانـی پێوانـەیی چـارەگی بـۆ داتـا ڕیزکراوەکـان لەمیانـەی دروسـت کردنـی دووبـارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە ریزبەندییان دەدۆزرێتەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

ریزبەندی چارەگی نزم = $\frac{\sum_{i=1}^{m} f_i}{4}$

ریزبەندی چارەگی بەرز= $3 \cdot \left(\frac{\sum_{i=1}^{m} f_i}{4}\right)$

$$\text{بەهای چارەگی نزم} = \text{نزمترین رادە بۆ توێژی دەکەوێت نیو چارەگی نزم} + \frac{\text{ڕیزبەندی چارەگی نزم} - \text{دووبارەیی کۆکراوەی نزمبووە بۆ توێژی پێش چارەگی}}{\text{دووبارەی بنەڕەتی بۆ توێژی چارەگی نزم}} \times \text{درێژی توێژی چارەگی نزم}$$

$$\text{بەهای چارەگی بەرز} = \text{نزمترین رادە بۆ توێژی دەکەوێت نیو چارەگی بەرز} + \frac{\text{ڕیزبەندی چارەگی بەرز} - \text{دووبارەیی کۆکراوەی نزمبووە بۆ توێژی پێش چارەگی}}{\text{دووبارەی بنەڕەتی بۆ توێژی چارەگی بەرز}} \times \text{درێژی توێژی چارەگی بەرز}$$

لەسەر ئەو بنچینەیەدا دەتوانرێت لادانی چارەگی بەدەست بهێنرێت، ئەویش بەبەکارهێنانی دەقی(5.4).

**نموونە(6.5):-** بۆئەم خشتەیی خوارەوە، لادانی چارەگی بدۆزەرەوە؟

| تویژەکانی داهات | ژمارەی خێزان | سنووری بەرزی تویژەکان | دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە |
|---|---|---|---|
| -0 | 18 | 200 | 18 |
| -200 | 72 | 400 | 90 |
| -400 | 154 | 600 | 244 |
| -600 | 111 | 800 | 355 |
| 1000-800 | 45 | 1000 | 400 |

**شیکار:-** چارەگی نزم و بەرزو ریزبەندییان بەم شێوەی خوارەوەیە:-

$$\text{ریزبەندی چارەگی نزم} = 100 = \frac{400}{4} = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i}{4}$$

$$\text{ریزبەندی چارەگی بەرز} = 300 = 3 \cdot \left(\frac{400}{4}\right) = 3 \cdot \left(\frac{\sum_{i=1}^{m} f_i}{4}\right)$$

بەهای چارەگی نزم = نزمترین پادەی چارەگی - بۆ توێژی دەکەوێت نیو چارەگی نزم + (ڕیزبەندی چارەگی نزم − دووبارەیی کۆکراوەی نزمبوو بۆ توێژی پێش چارەگی) / (دووبارەی بنەڕەتی بۆ توێژی چارەگی نزم) × درێژی توێژی چارەگی نزم

**بەهای چارەگی نزم** = ٤٠٠ + (١٠٠ − ٩٠) / ١٥٤ × ٢٠٠ = ٤١٢,٩٨٧ دینار

بەهای چارەگی بەرز = نزمترین پادەی چارەگی - بۆ توێژی دەکەوێت نیو چارەگی بەرز + (ڕیزبەندی چارەگی بەرز − دووبارەیی کۆکراوەی نزمبوو بۆ توێژی پێش چارەگی) / (دووبارەی بنەڕەتی بۆ توێژی چارەگی بەرز) × درێژی توێژی چارەگی بەرز

**بەهای چارەگی بەرز** = ٦٠٠ + (٣٠٠ − ٢٤٤) / ١١١ × ٢٠٠ = ٧٠٠,٩٠٠٩ دینار

لەسەر ئەو بنچینەیەدا دەتوانرێت لادانی چارەگی بەم شێوەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت :-

$$Q\cdot D=\frac{Q_u-Q_l}{2}=\frac{700.9009-412.987}{2}=143.957$$

**تێبینی** :- ئەو کاتە لادانی چارەگی بەکار دەهێنرێت، کاتێک بەهای شاز لەکۆمەڵە داتایەك هەبێت، لەپێوەری مەودا باشترە، بەڵام خەوشەکەی ئەوەیە پێوەرێکی نزیکردنەوەیە و هەموو بەهاکانیشی لەکاتی هەژمارکردن لەبەرچاو ناگرێت.

## 5.5 :- لادانی پێوەرکاری :- Standard Deviation

لەهەندێك جاریش پێ ی دەوترێت لادانی پێوانکاری، لەڕاستیدا ئەمە لەباشترین پێوەرەکانی پەرش و بڵاوییە، ئەمەش بەهۆی بوونی ژمارەیەك لایەنی پۆزەتیڤی نموونەیی، ئەمەش وای کردووە لەپێشەوەی پێوەرەکانەوە بێت لەکاتی پراکتیزەکردندا، هەروەها دەتوانرێت لەدۆخی بوونی داتا ڕیزکراوەکان و نا ڕیزکراوەکان بەکاربهێنرێت، ئەمەش بەشێوەی خوارەوە :-

**أ- لادانی پێوەرکاری بۆ داتا نا ریزکراوەکان :-**

بەوە پێناسە دەکرێت، کە بریتییە لەرەگی دووجای کۆیی بۆ نێوەنجی سەرجەمی چوار جای لادانی داتاکان لە نێوەنجی هەژمارکرندا واتە:-

$$S = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i - \bar{x})^2}{n-1}} \quad \cdots \quad (5.5)$$

هەروەها دەقی دیکەش هەیە کەداتا شراوە لەدەقی (5.5) کە دەتوانرێت لێیەوە لادانی پێوەرکاری پێ بدۆزرێتەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$S = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} x_i^2 - \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} x_i\right)^2}{n}}{n-1}} \quad \cdots \quad (5.6)$$

$$S = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} x_i^2 - n\bar{x}^2}{n-1}} \quad \cdots \quad (5.7)$$

**نموونە (7.5) :-** ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییە لە نمرەی بەشی ئابووری لەوانەی بنەماکانی زانستی ئامار ئەویش بەم شێوەی خوارەوەیە :-

| $x_i$ | 50 | 70 | 54 | 45 | 60 | 65 | 85 | 38 | 90 | 83 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

**داواکاری :-** لادانی پێوەر کاری بۆ نمرەی قوتابیان هەژمار بکە ؟

**شیکار :-** یەکەم جار نێوەنجی هەژمارکردن بۆ ئەم داتایانەی خوارەوە دەردەهێنین :-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{10} x_i}{10} = \frac{50+70+\cdots+83}{10} = \frac{640}{10} = 64$$

دەتوانرێت هەژمارکردن ئاسان بکەین ئەویش لەمیانەی دروست کردنی ئەم خشتەیەی خوارەوە:-

| داتاکان $x_i$ | $x_i - \bar{x}$ | $(x_i - \bar{x})^2$ | $x_i^2$ |
|---|---|---|---|
| 50 | 14-=64-50 | 196 | 2500 |
| 70 | 6=64-70 | 36 | 4900 |
| 54 | 10-=64-54 | 100 | 2916 |
| 45 | 19-=64-45 | 361 | 2025 |
| 60 | 4-=64-60 | 16 | 3600 |
| 65 | 1=64-65 | 1 | 4225 |
| 85 | 21=64-85 | 441 | 7225 |
| 38 | 26-=64-38 | 676 | 1444 |
| 90 | 26=64-90 | 676 | 8100 |
| 83 | 19=64-83 | 361 | 6889 |
| سەرجەم | 0 | 2864 | 43824 |

لەمیانەی دەقی(5.5) دەتوانین لادانی پێوەرکاری بەم شێوەی خوارەوە بەدەست بهێنین :

$$S = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i - \bar{x})^2}{n-1}} = \sqrt{\frac{2864}{10-1}} = \sqrt{318.2222} = 17.8388$$

یان لەمیانەی دەقی (5.6) دەتوانین بەم شێوەی خوارەوە لادانی پێوەرکاری دەربهێنین :-

$$S = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} x_i^2 - \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} x_i\right)^2}{n}}{n-1}} = \sqrt{\frac{(43824) - \frac{(640)^2}{10}}{10-1}}$$

$$= \sqrt{\frac{43824 - 40960}{9}} = \sqrt{\frac{2864}{9}} = \sqrt{318.2222} = 17.8388$$

یاخود لەمیانەی دەقی (5.7) دەتوانین لادانی پێوەرکاری بەم شێوەی خوارەوە بەدەست بهێنین :-

$$S=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}x_i^2-n\bar{x}^2}{n-1}}=\sqrt{\frac{43824-(10)(64)^2}{10-1}}$$

$$=\sqrt{\frac{43824-(10)(4096)}{9}}=\sqrt{\frac{2864}{9}}=17.8388$$

## ب- لادانی پێوەرکاری بۆداتا ڕیزکراوەکان :

دەتوانرێت لادانی پێوەرکاری بۆ داتا ڕیزکراوەکان هەژمار بکرێت، ئەویش لەمیانەی دۆزینەوەی سەنتەری توێژەکان و جاران کردنی بە دووبارەکانی بەرامبەرییان، لە نەژمارکردنی نێوەنجی هەژمارکردن بۆ داتا ڕیزکراوەکان و دۆزینەوەی لادانەکانی سەنتەری توێژەکان لە نێوەنجی هەژمارکردن، بۆئەمەش پشت بەپراکتیزەکردنی ئەم دەقەی خوارەوە دەبەستین :-

$$S=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{m}f_i(x_i-\bar{x})^2}{\sum_{i=1}^{m}f_i-1}}\qquad\cdots\quad(5.8)$$

هەروەها ژمارەیەك دەقی دیکە هەیە، کەداتاشراوە لەم دەقەی سەرەوە، کە لەمیانەیدا دەتوانین هەژماری لادانی پێوەرکاری بکەین، کەبواری باسکردنی نییە لەم کتێبەدا.

**نموونە**( 8.5 ):- ئەم خشتەیەی خوارەوە بریتییە لەتوێژی بەرهەم لە کارگەی شیشارو بیشار بەرامبەر بە ژمارەی کرێکاران

| دووبارە (ژمارەی کرێکاران) | توێژی بەرهەم |
|---|---|
| 2 | 20-10 |
| 8 | 30-20 |
| 9 | 40-30 |
| 7 | 50-40 |
| 4 | 60-50 |

**داواکاری :-** لادانی پێوەرکاری بدۆزەرەوە.

**شیکار :-** بۆ هەژمارکردنی لادانی پێوەرکاری پشت بەم خشتەی خوارەوە دەبەستین :-

| تویژەکان | دووبارەکان $f_i$ | سەنتەری تویژەکان $x_i$ | $f_i x_i$ | $x_i - \bar{x}$ | $(x_i - \bar{x})^2$ | $f_i(x_i - \bar{x})^2$ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 20-10 | 2 | 15 | 30 | 21- | 441 | 882 |
| 30-20 | 8 | 25 | 200 | 11- | 121 | 968 |
| 40-30 | 9 | 35 | 315 | 1- | 1 | 9 |
| 50-40 | 7 | 45 | 315 | 9 | 81 | 567 |
| 60-50 | 4 | 55 | 220 | 19 | 361 | 1444 |
| سەرجەم | 30 | | 1080 | | | 3870 |

یەکەمجار ژمارکردنی نێوەنجی هەژمارکردن دەردەهێنین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{5} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{5} f_i} = \frac{1080}{30} = 36$$

لەمیانەی ئەم دەقەدا(5.8) هەژماری لادانی پێوەرکاری دەکەین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

$$S = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{5} f_i (x_i - \bar{x})^2}{\sum_{i=1}^{5} f_i - 1}} = \sqrt{\frac{3870}{30-1}} = \sqrt{133.4483} = 11.552$$

**تێبینی :-** لادانی پێوەرکاری، بەیەکێك لەگرنگترین پێوەرەکانی پەرشوبلاوی دادەنرێت، کە بەرامبەر گرنگی نێوەنجی هەژمارکردنە لەپێوەرەکانی ناکۆکی ناوەندی، ئەویش لەبەر ئەوەی هەموو داتاکان لەژمارکردن لەبەرچاو دەگرێت، سەرباری ووردی و ئاسانی ئەو پێوەرە، هەروەها خەڵسەتە ماتماتیکی و ئامارییەکانی نایابە، کەدەتوانرێت لەشیکردنەوەو یاساکان بەکاربهێنرێت، کەدەچێتە نێو پلەی پەرشو بلاوی، هەروەکو لە دۆخی لێکۆڵینەوەی ئەگەرەکان و بژاردەکان و ئەزموونە ئامارییەکان بەرچاو دەکەون، بەلام خەوشەکەی ئەوەیە بە بەهای شازەکان کاریگەر دەبێت و بەزەحمەت لەداتا باسەنی یەکان هەژمار دەکرێت.

## 6.5:- جیاکاری :-The Variance

جیاکاری بریتییە لە چوارجای لادانی پێوەرکاری بۆکۆمەڵەیەك بەها بۆیە هێمای ($S^2$) ئاماژە بەجیاکاری بەهای بژاردە دەکات، لەهەمان کاتدا ($\sigma^2$) ئاماژە بەجیاکاری هەمووکۆمەڵگا دەکات و دەتوانرێت لەدۆخی داتا نا ڕیزکراوەکان و دۆخی داتا ڕیزکراوەکان بدۆزرێتەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

### أ- جیاکاری بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان :-

دەتوانرێت جیاکاری بۆداتا نا ڕیزکراوەکان لەمیانەی دووجای لادانی پێوەرکاری لەدەقی(55) یان (5.6) یاخود(5.7) دەربهێنرێت، واتەلەمیانەی هەژمارکردنی لادانی بەهای تاکەکانی بژاردەکە لە نێوەنجی هەژمارکردن بەدابەش کردن لەسەر پلەی ئازادی (n-1) بەبێ وەرگرتنی ڕەگی دووجایی دەردەهێنرێت، واتە:-

$$S^2 = \frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i - \bar{x})^2}{n-1} \qquad \cdots \quad (5.9)$$

لەهەمان کاتدا دەتوانرێت هەژمار بکرێت بۆ کۆمەڵگا لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە:-

$$\sigma^2 = \frac{\sum_{i=1}^{N}(x_i - \bar{x})^2}{N-1} \qquad \cdots \quad (5.10)$$

**نموونە(9.5)**: بۆ ئەم داتایانەی خوارەوە جیاکاری بدۆزەرەوە؟

| $x_i$ | 5 | 7 | 4 | 5 | 6 | 5 | 6 | 2 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

**شیکار** :- یەکەمجار نێوەنجی هەژمارکردن دەردەهێنین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{8} x_i}{8} = \frac{5+7+\cdots+2}{8} = \frac{40}{8} = 5$$

دەتوانرێت جیاکاری بژاردە بەم شێوەیە بدۆزرێتەوە:-

$$S^2=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2}{n-1}=\frac{\sum_{i=1}^{8}(x_i-\bar{x})^2}{8-1}=\frac{(5-5)^2+(7-5)^2+\cdots+(2-5)^2}{7}$$

$$=\frac{0+4+\cdots+9}{7}=\frac{16}{7}=2.2857$$

## ب- جیاکاری بۆداتا ڕیزکراوەکان :

دەتوانرێت جیاکاری داتا ڕیزکراوەکان لەبژاردە هەژماربکرێت، ئەویش لەمیانەی چوارجای دەقی(5.8)، واتە:-

$$S^2=\frac{\sum_{i=1}^{m}f_i(x_i-\bar{x})^2}{\sum_{i=1}^{m}f_i-1} \qquad \cdots \quad (5.11)$$

**نموونە :-**( 10.5 ) ئەم خشتەی خوارەوە بریتییە لە توێژی کرێ لەبەرامبەر ژمارەی فەرمانبەران لە دەستەی ئاماریی هەرێمی کوردستاندا، داواکاری مەزندەی جیاکاری کرێ بکە؟

| دووبارەکان ( ژمارەی فەرمانبەران ) | توێژی کرێ |
|---|---|
| 20 | 300-200 |
| 30 | 400-300 |
| 60 | 500-400 |
| 44 | 600-500 |
| 32 | 700-600 |
| 14 | 800-700 |

**شیکار:-** بۆ هەژمارکردنی جیاکاری هەڵدەستین بەدروست کردنی ئەم خشتەی خوارەوە:-

| $f_i(x_i-\bar{x})^2$ | $(x_i-\bar{x})^2$ | $x_i-\bar{x}$ | $f_ix_i$ | سەنتەری توێژەکان $x_i$ | دووبارەکان $f_i$ | توێژەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1152000 | 57600 | 240- | 5000 | 250 | 20 | 300-200 |
| 588000 | 19600 | 140- | 10500 | 350 | 30 | 400-300 |
| 96000 | 1600 | 40- | 27000 | 450 | 60 | 500-400 |
| 158400 | 3600 | 60 | 24200 | 550 | 44 | 600-500 |
| 819200 | 25600 | 160 | 20800 | 650 | 32 | 700-600 |
| 946400 | 67600 | 260 | 10500 | 750 | 14 | 800-700 |
| 3760000 | | | 98000 | | 200 | سەرجەم |

یەکـەمجار هەڵدەسـتین بـە ژمـارکردنی نێـوەنجی هـەژمارکردن، ئـەویش بـەم شـێوەی خوارەوە :-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{6} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{6} f_i} = \frac{98000}{200} = 490$$

لەمیانەی دەقی (5.11) هەژماری جیاکاری دەکەین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

$$S^2 = \frac{\sum_{i=1}^{6} f_i (x_i - \bar{x})^2}{\sum_{i=1}^{6} f_i - 1} = \frac{3760000}{200 - 1} = 18894.4724$$

تێبینـی :- لایەنـە پـۆزەتیڤ و نێگـەتیڤ و خەسـڵەتەکانی جیاکـاری بریتییـە لەهـەمان لایەنی پـۆزەتیڤ و نێگـەتیڤ و خەسـڵەتەکانی لادانـی پێوەرکـاری، دەتـوانین گـرنگترین خەسڵەتەکانی لەم خاڵانەی خوارەوە بخەینەڕوو :-

جیاکاری هەمیشە گەورەترە یان یەکسانە بە سفر.

1- ئەگەر بێتو $y_i = a\, x_i$ ئەوا $s_y^2 = a^2 \cdot s_x^2$

2- ئەگەر بێتو $y_i = x_i \mp a$ ئەوا $s_y^2 = s_x^2$

3- ئەگەر بێتو $y_i = a\, x_i \mp b$ ئەوا $s_y^2 = a^2 \cdot s_x^2$

## 7.5 :- هاوکۆلکەی پەرشوبلاوی :- Coefficient of Dispersion

جاری وا هەیە پێویستمان بەبەراوردکردنی نێوان پەرشوبلاوی دوو کۆمەڵە یـان زیـاتر لەبەها جۆراوجۆرەکانەوە لەگەڵ یەکترییەوە دەبێت، لەڕووی ناوەڕاستی هەژمارکردنـەوە یـان بـەهای کۆمەڵـە جۆراوجۆرەکـان پێوانـە کـراوە بەیەکـە جۆراوجۆرەکـان، لەوکاتـەدا ناتوانرێـت پێوەرەکـانی پەرشـوبلاوی ڕەهـا بـە تـەنیا بـەکاربهێنین، بـەڵکو پێویسـتمان بەبـەکارهێنانی پێوەرەکـانی پەرشـوبلاوی ڕێـژەیی هەیـە، کەخاڵییـە لەیەکـەکانی پێوانەکردن، گەلێك جۆرمان هەیە لەوانـە هاوکۆلکـەی پەرشـوبلاوی، کـە پشـت بەمـەودا

دەبەستێت یان لادانی چارەگی یاخود لادانی نێوەنج، لەگرنگترین ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێت بریتییە لە لادانی پێوەرکاری یان پێ ی دەڵێن هاوکۆلکەی جیاوازی (Coefficient of Variation) کەدەتوانرێت لەدۆخی داتا ڕیزکراوەکان و داتا نا ڕیزکراوەکان لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە بدۆزرێتەوە

$$C\cdot V = \frac{S}{\bar{x}} \cdot 100 \qquad \cdots \quad (5.12)$$

**نموونە**(11.5) بەراورد لەنێوان جیاوازی ڕێژەیی لەدرێژی و کێشی بکەو ئەوەش دیاری بکە کە کامەیان هاوشێوەی زیاتر بۆ ئەوکۆمەڵە قوتابییە ئەگەر بێتو نێوەنجی درێژی(172) سم و لادانی پێوەرکاری (10.5)، هەروەها نێوەنجی کێشی 75 کگم و لادانی پێوەرکاری(15) بێت؟

**شیکار** :- بەهۆی ئەوەی هەردوو دیاردە جیاوازن لەڕووی یەکەی پێوانەدا بۆیە پێویستە پێوەری پەرشوبڵاوی ڕێژەیی وەکو هاوکۆلکەی جیاوازی بۆ بەراوردکاری لەنێوان مەودای جیاوازی پەرشوبڵاوی لەنێوان درێژی و کێش بەکاربهێنرێت:

سەبارەت بەدرێژی :-

$$C\cdot V = \frac{S}{\bar{x}} \cdot 100 = \frac{10.5}{172} \cdot 100 = 6.1047$$

سەبارەت بەکێش :-

$$C\cdot V = \frac{S}{\bar{x}} \cdot 100 = \frac{15}{75} \cdot 100 = 20$$

لەمەش ئەوە ڕوون دەبێتەوە ئەو قوتابیانە زۆر هاوشێوەن لە درێژی نەك لەکێشدا، چونکە هاوکۆلکەی پەرشوبڵاوی لەدرێژی کەمترە لەهاوکۆلکەی پەرشوبڵاوی لەکێشدا .

**نموونە** (12.5) :- بەراورد بکە بەبەکارهێنانی هاوکۆلکەی جیاوازی مەودای کەلێن لەنێوان توێژەکانی بەرهەم لەنموونەی (8.5) و توێژی کرێ لەنموونەی (10.5) .

**شیکار** :- لەمیانەی نموونەی (8.5) ئەمانەمان بەدەست هێنا :- نێوەنجی هەژمارکردن = 36 لادانی پێوەرکاری = 11.552 لەبەرامبەردا لەنموونەی (10.5) نێوەنجی هەژمارکردن = 490 و لادانی پێوەرکاری = 18894.4724، بۆیە دەتوانرێت هاوکۆلکەی جیاوازی بەم جۆرە بدۆزرێتەوە .

سەبارەت بەتوێژەکانی بەرهەم :-

$$C\cdot V = \frac{S}{\bar{x}} \cdot 100 = \frac{11.552}{36} \cdot 100 = 32.0889$$

سەبارەت بەتوێژەکانی کریێ:—

$$C\cdot V = \frac{S}{\bar{x}} \cdot 100 = \frac{18894.4724}{490} \cdot 100 = 38.5601$$

لەمەش ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کەتوێژەکانی بەرهەم زیاتر هاوشێوەی توێژەکانی کرێێن، چونکە هاوکۆلکەی پەرشوبلاوی لەتوێژەکانی بەرهەم کەمترە لەهاوکۆلکەی پەرشوبلاوی لەتوێژەکانی کرێ دا .

## 8.5 :**شکانەوە و جوڵاوی چەماوە ( الالتواء و التفلطح )** :-

چەماوەی دووبارەییە، کە دابەشکردنی هاوشێوەیە یان دابەشکردنی هاوشێوە نییە، چەماوەی ناهاوشێوە پێ ی دەوترێت شکانەوەی چەماوە (**ملتوية**) (**الالتواء**) بریتییە لەدووری چەماوە لەهاوشێوەیی، ئەمەش مانای ئەوەیە بەهاکەی بیرۆکەی ئەوە دەداتە دەستەوە کەبەهای داتاکان تەمەرکوز دەکەن، ئینجا ئەگەر بێتو ئەو داتایانەی لە دوروبەری بەهای داتای بچووك زیاتر لەبەهای داتای گەورە تەمەرکوزییان کرد، ئەوا دابەشکردنی ئەو داتایانە دەشکێتەوە بەرەو لای ڕاست، کەپێ ی دەگوترێت (ئیلتوای موجەب)، بەلاّم ئەگەر بێتو پێچەوانە بوو ئەوا ئیلتوای دابەشکردنی داتاکان سالیب دەبێت، واتەبەرەو لای چەپ دەشکێتەوە، بەلاّم ئەگەر بێتو یەکسان بوو بەسفر، ئەمەش مانای ئەوەیە هاوشێوەی دابەشکردنە. کاتێك دابەشکردن بەرەو لای ڕاست دەشکێتەوە، ئەوا بەهای توندەکان لەبەرەو ڕاست چوون، کارێگارییان لەسەر نێوەنجی هەژمارکردن دەبێت و بەرەو لای ڕاست ڕای دەکێشێت، بەمەش نێوەنج گەورەتر دەبێت لەناوەڕاست مەنوال. بەلاّم ئەگەر بێتو دابەشکردن بەرەو لای چەپ بشکێتەوە ئەوا بەهای توند بچووك دەبێت و ڕای دەکێشێت بەرەو لای چەپ بەمەش ناوەڕاستی هەژمارکردن بچووکتر دەبێت لەناوەڕاستی مەنوال، کەچی ئەگەر بێتو دابەش کردنەکە هاوسەنگ بێت ئەوا نێوەنج هەژمارکردن یەکسان دەبێت بەناوەڕاست و مەنوال، ئەم شێوانەی خوارەوە ئەمانە ڕوون دەکەنەوە :—




**شێوەی ( 5.1 ):دابەشکردنی سروشتی و شکانەوەی سالیب و موجەب ڕوون دەکاتەوە**

هـەروەها جوڵـاوی چـەماوە ( **الـتفلطح او التفـرطح** ) بریتییـە لـەدووبارەیی بـەهاکان لەهەردوو لای ئەو دابەشکردنە، ئەمەش بریتییە لـە پلـەی بـەرزی لوتکـەی دابـەش کـردن سـەبارەت بەدابەشـکردنی سروشـتی، ئەگـەر بێتـو بـەهای جوڵـاوی چـەماوە ( **الـتفلطح** ) گەورەبێت، ئـەوا ئـەو دابەشـکردنە لوتکـەی نـزم دەبێـت، پـێ ی دەوترێت دابەشـکردنی گـەورەی جوڵـاوی چـەماوە ( **الـتفلطح** )، بـەلاّم ئەگـەر بێتـو بـەهای جوڵـاوی چـەماوە ( **الـتفلطح** ) بچـووك بێـت، ئـەوا دابەشـکردنی لوتکـەیی بـەرز دەبێـت و پـێ ی دەوترێـت دابەشکردنی کەمی جوڵاوی چـەماوە (**الـتفلطح**) ، ئەگـەر بێتـو بـەهای جوڵـاوی چـەماوە (**التفلطح**) ناوەڕاسـت بێـت پـێ ی دەوترێـت دابەشـکردنی ناوەڕاسـتی جوڵـاوی چـەماوە (**التفلطح**)، ئەم شێوانەی خوارەوە ڕوونی دەکەنەوە :–



دابەشكردنی كەمی جوڵاوی چەماوە



دابەشكردنی گەوردی  جوڵاوی چەماوە



دابەشكردنی مام ناوەندی جوڵاوی
چەماوە

هەروەها چەندان ڕێگای دیکە بۆهەژمارکردنی شکانەوە و جوڵاوی چەماوە (**الالتواء و التفلطح**) هەیە، کەلەم کتێبەدا بوار نییە باسی لێوە بکەین .

# ڕاهێنانی بەشی پێنجەم

1.5:- مەبەست لە پێوەرەکانی پەرشوبڵاوی چییە؟

2.5:- مەوداو لادانی نێوەنج بۆ خەرجی مانگانەی بژاردەیەکی شاری هەولێر بدۆزەرەوە ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 520 | 740 | 950 | 650 | 500 | 200 | 900 | 1000 | 800 | 700 | 400 |

3.5: ئەگەر بێتو بەکاربردنی خێزانی مانگانە بۆ برنج لەشاری هەولێر و سلێمانی بەم شیوەیە بیت :-

| | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | 7.8 | 7.50 | 6.5 | 5.9 | 2.70 | 9.06 | 10.3 | 13.9 | 12.4 | 15 | 12 |
| سلێمانی | 3.4 | 4.9 | 13 | 12 | 5.8 | 7.9 | 4.8 | 6.8 | 5.9 | 10 | 9.8 |

**داواکاری :-** زانینی کامە شار زیاترە هاوشێوەیە بەپشت بەستن بەمەوداو لادانی نێوەنج.

4.5:- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییە لەکێشی بژاردە قوتابیان کە ژمارەییان (15) قوتابییە :-

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $x_i$ | 45 | 57 | 46 | 53 | 48 | 60 | 59 |
| 67 | 62 | 54 | 49 | 44 | 68 | 55 | 46 |

**داواکاری :-** هەژمارکردنی لادانی چارەگی و پێوەرکاری و جیاکاری؟

5.5:- لادانی چارەگی و پێوەرکاری و جیاکاری بۆئەم خشتە دابەشکردن دووبارەیی خوارەوە بدۆزەرەوە :-

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| توێژەکان | 2-0 | 4-2 | 6-4 | 8-6 | 10-8 |
| دووبارەکان | 4 | 6 | 8 | 6 | 4 |

6.5:- بەراوردی ئەم دووخشتە دووبارەیی خوارەوە بەبەکارهێنانی هاوکۆلکەی جیاکاری بکە :-

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| توێژەکان | 6-2 | 10-6 | 14-10 | 18-14 | 22-18 |
| دووبارەکان | 5 | 7 | 8 | 4 | 3 |
| توێژەکان | 3-0 | 6-3 | 9-6 | 12-9 | 15-12 |
| دووبارەکان | 14 | 16 | 18 | 16 | 14 |

## 1.6 :- پێشەکی :-پێکەوەلکان (Correlation)

بریتییە لە ئامرازێکی شیکردنەوەی ئامار بۆ مەبەستی پێوانەکردنی چەندایەتی پێکەوەلکان و ئاراستەکانی لەنێوان دووگۆڕاو یان زیاتر، پێوانەکردنی پێکەوەلکان بۆ زانینی سروشتی گۆڕانکاری لەنێوان دوو گۆڕاو یان زیاتر، ئەویش بەهۆی خەسڵەتی دیاریکراو کە کۆیان دەکاتەوە، داواکاری ئەوەیە لەم دۆخەدا بزانرێت ئایا خەسڵەتەکانی ئەو گۆڕاوە پەیوەندیدارە بەخەسڵەتەکانی گۆڕاوێکی دیکە یان گۆڕاوەکانی دیکە، نموونەش بۆ ئەمە گەلێك زۆرە، بۆنموونە :- لێکۆڵینەوە لەپەیوەندی نێوان داهاتی مانگانە و خەرجی مانگانەی خێزان، واتە ڕوودانی جوڵە لەخەرجی مانگانە پەیوەندیدارە بەجوڵەی داهاتی مانگانەی خێزان ، تێبینی ئەوە دەکرێت، کە خەرجییەکان زیاد دەکات، کاتێك داهاتی مانگانەی خێزان زیاد دەکات، هەروەها تێبینی پەیوەندی نێوان نرخی کالاو بڕی خستنەڕووی لەبازاڕ دەخاتەڕوو.

**تێبینی** :- پێویستە یەکەمجار پەیوەندیکی مەنتقی و زانستی لەنێوان دوو گۆڕاو هەبێت، دوای ئەوە کردەی هەژمارکردنی پێکەوەلکان ئەنجام دەدرێت ، بۆنموونە:- پەیوەندی مەنتقی لەنێوان خێرایی ئاوی دۆڵەکان و نرخی زەوی لەشاردا نییە، لێرەدا ناتوانرێت پێکەوەلکان بدۆزرێتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی پەیوەندیەکی مەنتقی و زانستی لەنێوانیاندا هەیە ، چەندان جۆر هاوکۆلکەی هەیەو لەم بەشەدا باس لە گرنگترینیان دەکەین:-

## 2.6 :- هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە :- Simple Linear Correlation Coefficient

یان پیێ ی دەگوترێت هاوکۆلکەی پێکەوەلکان (Pearson) بۆ لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو بەکار دەهێنرێت، کە خەسڵەتی شایستەی پێوانەکردنیان هەیە، وەك کێش، درێژی، تەمەن، دینار...هتد، هێما بۆ بژاردە $(r_{xy})$ دەکرێت و بۆ کۆمەلگاش هێمای $(p_{xy})$ دەبێت، ژمارەیەك دەقی ماتماتیکی بۆ هەژمارکردنی هاوکۆلکەی پێکەوەلکان بۆداتاکان هەیە، کەریزبەندی کراوە بەشێوەی جووت بەم شێوەی خوارەوە:- $(x_1, y_1), (x_2, y_2), \cdots, (x_n, y_n)$

هەروەها هاوکۆلکەی پێکەوەلکان بەبەکارهێنانی ئەم دەقەی خوارەوە هەژماردەکرێت:-

$$r_{xy}=\frac{\operatorname{cov}(x,y)}{S_x . S_y}=\frac{S_{xy}}{S_x . S_y} \quad \cdots \quad (6.1)$$

پێی دەگوترێت جیاکاری هاوبەشCovariance لە نێوان y و x
کە

$$\operatorname{cov}(x,y)=S_{xy}$$

کە بە پێی ئەم دەقەی خوارەوە هەژماردەکرێت:-

$$\operatorname{cov}(x,y)=S_{xy}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{n-1} \quad \cdots \quad (6.2)$$

بۆیە :-

$$r_{xy}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})/n-1}{\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2}{n-1}}.\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}{n-1}}}$$

$$\therefore r_{xy}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{\sqrt{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2.\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}} \quad \cdots \quad (6.3)$$

تێبینی ئەوە دەكرێت لەمیانـەی ئـەم دەقـەی سـەرەوە، ژێـرەوە هەمیشـە موجەبـە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە نیشانەی هاوکۆلکەی پێکەوەلکان، لەمیانەی نیشانەی سەرەوە دیاری دەکرێت، ئینجا ئەگەر بێتو سـەرەوە (جیاکـاری هاوبـەش) موجـەب بـوو، ئەمـەش مانای ئەوەیە پێکەوەلکان موجەبەو پێچەوانەکەشـی ڕاسـتەکەیەتی، بەهاکەشـی بریتییـە لە:-

$$-1 \le \rho_{xy} \quad \text{أو} \quad r_{xy} \le 1$$

هەروەها ئەمانەی خوارەوەمان هەیە:



شێوەی بڵاوی جووتەی بەهاکان، ئەوەڕوون دەکاتەوە، کەپەیوەندی هێڵی(سالیب یان موجەب) یان ناهێڵی یاخود نەبوونی پەیوەندی نێوان دووگۆڕاو، ئەم شێوانەی خوارەوە ڕوونی دەکاتەوە:



پێکەوەلکانی سالیب    پێکەوەلکانی موجەب    پێکەوەلکانی هێڵی    نەبوونی پێکەوەلکان

**شێوەکانی بڵاوکردنەوە بۆ هەندێك دۆخی پێکەوەلکان و نەبوونییەوە**

**نموونــە :-** توێــژەرێکی ئــابووری دەیــەوێت لێکۆڵینــەوە لەپەیوەنــدی نێــوان داهــاتی مانگانەی خێزان و خــەرجی مانگانــەی خێــزان لەشــاری سلێمانی لەمیانــەی بژاردەیــەکی ڕەمەکی بەم شێوەی خوارەوە بکات:-

| داهاتی مانگانەی خێزانx ( هەزار دینار) | خەرجی مانگانەی خێزانy ( هەزار دینار) |
|---|---|
| 420 | 340 |
| 600 | 450 |
| 200 | 180 |
| 700 | 560 |
| 900 | 700 |
| 850 | 650 |
| 300 | 250 |
| 540 | 420 |
| 780 | 620 |
| 860 | 650 |
| 450 | 350 |

**داواکاری بریتییە لە :-**

1- شـــــێوەی بڵاوبونــــــەوەی داتاکـــــــانی ســـــــەرەوە بکێشــــــە؟

2- بـــــڕی پێکـــــەوەلکانی نێـــــوان ئـــــەودوو دیارەیـــــە چـــــەندە؟ بکێشرێت، ئەویش بەشێوەی

**شیکار:**- دەتوانرێت شێوەی بڵاوبوونەوەی لەمیانەی جووتەی بەهای (Y,X ) خوارەوە:-




**شێوەی (6.1 ): شێوەکانی بڵاوکردنەوە بۆ هەندێك دۆخی پێکەوەلکان و نەبوونییەوە**

لەمیانەی ئەم شێوە بڵاو بۆوە، تێبینی بوونی پەیوەندی ڕاستەوانە لەنێوان داهات و خەرجی مانگانەی خێزان لە شاری سلێمانی دەکرێت .

2) بۆ دۆزینەوەی هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە، لێرەدا نێوەنجی هەژمارکردن دەردەهێنین و ئەم خشتەی خوارەوەش دروست دەکەین:-

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{11} x_i}{11} = \frac{420 + 600 + \cdots + 450}{11} = \frac{6600}{11} = 600$$

$$\bar{y} = \frac{\sum_{i=1}^{n} y_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{11} y_i}{11} = \frac{340 + 450 + \cdots + 350}{11} = \frac{5170}{11} = 470$$

| $(y_i-\bar{y})^2$ | $(x_i-\bar{x})^2$ | $(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})$ | $(y_i-\bar{y})$ | $(x_i-\bar{x})$ | Y | X | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 16900 | 32400 | 23400 | 130- | 180- | 340 | 420 | 1 |
| 400 | 0 | 0 | 20- | 0 | 450 | 600 | 2 |
| 84100 | 160000 | 116000 | 290- | 400- | 180 | 200 | 3 |
| 8100 | 10000 | 9000 | 90 | 100 | 560 | 700 | 4 |
| 52900 | 90000 | 69000 | 230 | 300 | 700 | 900 | 5 |
| 32400 | 62500 | 45000 | 180 | 250 | 650 | 850 | 6 |
| 48400 | 90000 | 66000 | 220- | 300- | 250 | 300 | 7 |
| 2500 | 3600 | 3000 | 50- | 60- | 420 | 540 | 8 |
| 22500 | 32400 | 27000 | 150 | 180 | 620 | 780 | 9 |
| 32400 | 67600 | 46800 | 180 | 260 | 650 | 860 | 10 |
| 14400 | 22500 | 18000 | 120- | 150- | 350 | 450 | 11 |
| 315000 | 571000 | 423200 | 0 | 0 | 5170 | 6600 | سەرجەم |

لەمیانەی دەقـی (6.3) دەتوانرێـت پێکـەوەلکانی هێڵـی سـادە بەدەسـت بـەم شـێوەی خوارەوە:ـ

$$r_{xy}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{\sqrt{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2.\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}}=\frac{423200}{\sqrt{(571000)(315000)}}$$

$$=\frac{423200}{424104.9398}=0.9978$$

بهێنرێت، ئـەویش ئەمـەش مانـای ئەویـە کەپێکـەوەلکانی ڕاسـتەوانە(موجەب)ی بـەهێزی هەیە، کەیەکسـانە بـە(99.78٪) لـەنێوان داهـات و خـەرجی مانگانـەی خێـزان لەشـاری سلێمانی .

هەروەها دەتوانرێت پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەڕێگایەکی دیکە بدۆزرێتەوە، ئـەویش لەمیانەی هەژمارکردنی لادانی پێوەرکاری بۆ هەریەك لەداهات و خەرجی، ئینجا جیاکاری هاوبەش هەژمار دەکرێت ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :ـ

$$S_x=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2}{n-1}}=\sqrt{\frac{571000}{11-1}}=\sqrt{57100}=238.9561$$

$$S_y=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}{n-1}}=\sqrt{\frac{315000}{11-1}}=\sqrt{31500}=177.4824$$

$$\operatorname{cov}(x,y)=S_{xy}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{n-1}=\frac{423200}{11\text{-}1}=42320$$

لەمیانەی دەقی (6.1) دەتوانرێت هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەشێوەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت:-

$$r_{xy}=\frac{\operatorname{cov}(x,y)}{S_x.S_y}=\frac{S_{xy}}{S_x.S_y}$$

$$=\frac{42320}{(238.9561)(177.4824)}=0.9978$$

**نموونە**( 2.6 ):- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییە لەبڕی خستنەڕووی کالآیەکی دیاریکراوو نرخی یەکەیەکی ئەوکالآیە:-

| 10 | 9 | 8 | 7 | 5 | 9 | **بڕی خواست y** |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 5 | **نرخ x** |

**داواکاری :-** هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان بڕو نرخی خستنەڕوو هەژمار بکە ؟

**شیکار:-**

$$\bar{x}=\frac{\sum_{i=1}^{n}x_i}{n}=5 \quad , \quad \bar{y}=8$$

بۆ هەژمارکردنی هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە هەڵدەستین بەدروست کردنی ئەم خشتەی خوارەوە:—

| $(y_i-\bar{y})^2$ | $(x_i-\bar{x})^2$ | $(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})$ | $y_i-\bar{y}$ | $x_i-\bar{x}$ | $y_i$ | $x_i$ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 0 | 0 | 1 | 0 | 9 | 5 |
| 9 | 4 | -6 | -3 | 2 | 5 | 7 |
| 1 | 1 | -1 | -1 | 1 | 7 | 6 |
| 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 8 | 5 |
| 1 | 1 | -1 | 1 | -1 | 9 | 4 |
| 4 | 4 | -4 | 2 | -2 | 10 | 3 |
| 16 | 10 | -12 | 0 | 0 | سەرجەم | |

بۆیە:—

$$\mathbf{r}_{xy}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{\sqrt{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2.\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}}=\frac{-12}{\sqrt{10}.\sqrt{16}}$$

$$=\frac{-12}{(3.1623)(4)}=\frac{-12}{26.533}=-0.9487$$

ئەمەش مانای ئەوەیە کە پلەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان بڕی خواست لە کالاَیەو یەکەی نرخ بریتییە لە (٪94.87)، ئەمەش پێکەوەلکانی پێچەوانەیە(سالیب) بەلگەیە لەسەر ئەوەی هەرکاتێك نرخی ئەوکالاَیە بەرزبێتەوە، ئەوە بڕی خواست نزم دەبێتەوە، ئەویش بەپشت بەستن بەم داتایانەوە.

## 3.6 :- هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی ریزبەندی سپێرمان :-

## Spearman's /rank/ Correlation Coefficient

هەندێك جار ئەو داتایانە لەجۆری باسەنی یان زۆر گەورە دەبن و داواکاریش بریتییە لە پێوانەکردنی هێزی پێکەوەلکانی هێڵی، لەم دۆخەدا دەتوانرێت ریزبەندی بەکاربهێنرێت، ئەویش لەمیانەی دیارکردنی ریزبەندی خەسڵەتەکان(یان ژمارەی گەورە)، کەپێویستە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت وەك ئەنجامی قوتابی لەتاقیکردنەوەی کۆتایی

ساڵ، ئاستی بژێوی و ئاستی زانستی و توانستی کرێکارو...هتد. دەتوانرێت ئەو پێکەوەلکانە بەکاربهێنرێت، کاتێك یەکێك یان هەردوو دیاردە بریتی بێت لەداتای پرەکان. دەتوانرێت پێکەوەلکانی ریزبەندی سپێرمان بەکاربهێنرێت، ئەویش لەمیانەی ڕیزبەندی خەسڵەتەکان(ژمارەی گەورە) بەشێوەی بەرز بۆوە یان نزم بۆوەو پێدانی هەریەك لەو خەسڵەتانەش بەهای ژمارەیی لە (n-1)، بەمەش خەسڵەتەکان بۆ بەهای ژمارەیی دەگۆڕدێت، لەدۆخی نەبوونی دووبارەبووەکانی ئەو خەسڵەتانە، ئەم دەقەی خوارەوە بەکاردەهێنین:-

$$r_{xy} = 1 - \frac{6 \cdot \sum_{i=1}^{n} d_i^2}{n(n^2-1)} \quad \cdots \quad (6.4)$$

کە $d_i$ بریتییە لە جیاوازی هەردوو ڕیزبەندی، واتە : $d_i = rx_i - ry_i$ کە پێویستە سەرجەمی یەکسان بێت بە سفر واتە : $\sum_{i=1}^{n} d_i = 0$

**نموونە**( 3.6 ):- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییە لە مەزەندەی ئاستی بژێوی بەرامبەر ئاستی زانستی بۆ ژمارەیەك کەس:

**داواکاری**:- هەژماری پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان هەردوو گۆڕاو بکە؟

| ئاستی بژێوی x | باشە | نایاب | خراپ | زۆر باشە | ناوەند | پەسەند |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاستی خوێندن y | ئامادەیی | ماستەر | دەخوێنێت و دەنووسێت | بەکالۆریۆس | سەرەتایی | نەخوێندەوار |

**شیکار** :- یەکەمجار هەڵدەستین بە ڕیزبەندی کردنی هەموو گۆڕاوەکان بەشێوەی بەرز بۆوەو پێدانی بەهای ژمارەیی بۆ هەریەکە یان بەم شێوەی خوارەوە:-

| ڕیزبەندی ئاستی خوێندن بەرزبۆوە X | خراپ | پەسەند | ناوەند | باشە | زۆر باشە | نایاب |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕیزبەندی $rx_i$ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 |

| ڕیزبەندی ئاستی خوێندن y بەرزبۆوە | نەخوێندەوار | دەخوێنێت و دەنووسێت | سەرەتایی | ئامادەیی | بەکالۆریۆس | ماستەر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕیزبەندی $ry_i$ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 |

له سەر ئەم بنچینەیەدا دەتوانین ئەم خشتەی خوارەوە دروست بکەین:

| $d_i^2$ | $d_i$ | ڕیزبەندی $ry_i$ | ڕیزبەندی $rx_i$ | ئاستی خوێندنy | ئاستی بژێویx |
|---|---|---|---|---|---|
| 0 | 0 | 4 | 4 | ئامادەیی | باشە |
| 0 | 0 | 6 | 6 | ماستەر | نایاب |
| 1 | -1 | 2 | 1 | دەخوێنیت و دەنووسێت | خراپ |
| 0 | 0 | 5 | 5 | بەکالۆریۆس | زۆرباشە |
| 0 | 0 | 3 | 3 | سەرەتایی | ناوەند |
| 1 | 1 | 1 | 2 | نەخوێندەوار | پەسەند |
| 2 | 0 | | | | سەرجەم |

دەتوانرێت پێکەوەلکانی هێڵی سادە بە دەست بهێنرێت ئەویش بە بەکارهێنانی ڕێگای سپێرمان ئەویش بە پێی ئەم دەقەی خوارەوە:

$$r_{xy} = 1 - \frac{6 \cdot \sum_{i=1}^{n} d_i^2}{n(n^2-1)} = 1 - \frac{6 \cdot (2)}{6 \cdot (6^2 - 1)}$$

$$= 1 - \frac{12}{6 \cdot 35} = 1 - \frac{12}{210} = 1 - 0.0571 = 0.9429$$

ئەمەش مانای ئەوەیە کە پەیوەندیەکی ڕاستەوانە(موجەب)ی بەهێز لە نێوان ئاستی بژێوی و ئاستی خوێندن بە ڕێژەی( 94.29٪) هەیە.

ئەوە بۆ هەر خەسڵەتێك بەهایەکی ژمارەیی بۆ دادەنرێت، هەتا ئەگەر لەبژاردەکە دووبارەش ببێتەوە، دوای ئەوە تێکڕای بەهای تەرخانکراو هەژماردەکرێت، ئینجا دووبارە ئەو خەسڵەتە دووبارانە تەرخان دەکرێتەوە، ئینجا بۆ دەستکاری دەکرێت لەمیانەی زیادکردنی بڕی (k) بۆ ( $\sum_{i=1}^{n} d_i^2$ )، ئەویش لە دۆخی پێشوو تا پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەدەست دەهێنرێت. واتە:—

$$r_{xy} = 1 - \frac{6 \cdot \left(\sum_{i=1}^{n} d_i^2 + k\right)}{n(n^2-1)} \quad \cdots \quad (6.5)$$

کەk  بریتییە لەسەرجەمی بەهای دووبارەبۆوە، کەلەمیانەی ئەم دەقە بەدەستمان دەکەوێت :-

$$k = \sum_{i=1}^{u} \frac{m_i\left(m_i^2 - 1\right)}{12} \qquad \cdots \quad (6.6)$$

u بریتییە لە ژمارەی بوونی خەسڵەتە دووبارەکانی هەر دوو گۆڕاو، $m_i$ بریتییە لە ژمارەی دووبارەی خەسڵەتی i.

**نموونە**( 4.6 ):- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییە لە مەزندەی کۆمەڵێك لەقوتابیانی بەشی کارگێڕی لەهەردوو وانەی کارگێڕی و ئامار. داواکاری هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی سپێرمان هەژمار بکە؟

| کارگێری x | نایاب | باشە | نایاب | لاواز | زۆرباشە | ناوەند | پەسەند |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامار y | باشە | پەسەند | زۆرباشە | پەسەند | باشە | باشە | ناوەند |

**شیکار**:- یەکەمجار ڕیزبەندی خەسڵەتەکانی هەریەك لەگۆڕاوەکان بەپێ ی بەرزبۆوە دەکەین و بەهای ژمارەیی بەهەریەکەیان دەدەین، ئەویش بەم شێوەیە :-

| ڕیزبەندی ئەنجامی وانەی کارگێری | لاواز | پەسەند | ناوەند | باشە | زۆر باشە | نایاب | نایاب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕیزبەندی $rx_i$ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 |
| تێکڕا | | | | | | 6.5 | |

| ڕیزبەندی ئەنجامی وانەی ئامار | پەسەند | پەسەند | ناوەند | باشە | باشە | باشە | زۆر باشە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕیزبەندی $ry_i$ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 |
| تێکڕا | 1.5 | | | 5 | | | |

لەمیانەی ئەم داتایانەی سەرەوە تێبینی بوونی سێ دۆخی دووبارە دەکەین u =3 ، دۆخی یەکەمی دووبارەبوو نایابەو دووبارەبۆتەوە $m_1$=2 ، دۆخی دووەمی دووبارەبوو پەسەندەو دووبارەبۆتەوە $m_2$ =2 و دۆخی سێیەمی دووبارەبوو بریتییە لەباشەو سێ جار دووبارە بۆتەوە 3=3 بۆیە بەهای(k) دەتوانرێت بەم شێوەیە هەژمار بکرێت:-

$$k=\sum_{i=1}^{3}\frac{m_i(m_i^2-1)}{12}=\frac{m_1(m_1^2-1)}{12}+\frac{m_2(m_2^2-1)}{12}+\frac{m_3(m_3^2-1)}{12}$$
$$=\frac{2(2^2-1)}{12}+\frac{2(2^2-1)}{12}+\frac{3(3^2-1)}{12}=0.5+0.5+2=3$$

دەتوانرێت ئەم خشتەیە دروست بکەیت:-

| $d_i^2$ | $d_i$ | ڕیزبەندی $ry_i$ | ڕیزبەندی $rx_i$ | ئامارY | کارگێری X |
|---|---|---|---|---|---|
| 2.25 | 1.5 | 5 | 6.5 | باشە | نایاب |
| 6.25 | 2.5 | 1.5 | 4 | پەسەند | باشە |
| 0.25 | -0.5 | 7 | 6.5 | زۆرباشە | نایاب |
| 0.25 | -0.5 | 1.5 | 1 | پەسەند | لاواز |
| 0 | 0 | 5 | 5 | باشە | زۆرباشە |
| 4 | -2 | 5 | 3 | باشە | ناوەند |
| 1 | -1 | 3 | 2 | ناوەند | پەسەند |
| 14 | 0 | | | | سەرجەم |

بەبەکارهێنانی دەقی(6.5) ئەمەی خوارەوە بەدەست دەهێنین :-

$$r_{xy}=1-\frac{6\cdot\left(\sum_{i=1}^{n}d_i^2+k\right)}{n(n^2-1)}=1-\frac{6.(14+3)}{7(7^2-1)}=1-\frac{102}{336}=1-0.3036=0.6964$$

ئەمەش مانای بوونی پەیوەندیکی ڕاستەوانەی(موجەب) ی بەهێز لەنێوان ئەنجامی هەردوو وانەی کارگێڕی و ئامار دەگەیەنێت.

## 4.6:- هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی بەشەکی :- Partial Correlation Coefficient

بریتییە لەلێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو($X_1$ و $X_2$ بۆنموونە) بە دورخستنەوەی کارێگاریی گۆڕاوی سێیەم($r_{23.1}$) لەسەر هەردوو گۆڕاو وهێمای($r_{12.3}$) وەردەگرێت، کەدەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت :-

$$r_{12.3}=\frac{r_{12}-r_{13}r_{23}}{\sqrt{\left(1-r_{13}^{2}\right)\left(1-r_{23}^{2}\right)}} \quad \cdots \quad (6.7)$$

کە($r_{12}$ و $r_{13}$ و $r_{23}$) بریتییە لەپێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان دوو گۆڕاو، کەدەتوانرێت لەمیانەی دەقی(6.3) بەدەست بهێنرێت. بەهەمان ڕێگا دەتوانرێت ئەمەش بەدەست بهێنرێت ($r_{13.2}$) واتە پێکەوەلکانی بەشی لەنێوان($X_1$ و $X_3$) بە دوورخستنەوەی گۆڕاوی دووەم ($X_2$) بەم شێوەیە سەبارەت بە ($r_{23.1}$)، بەڵام ئەگەر بێتو لێکۆڵینەوەکە لەپەیوەندی دوو گۆڕاوی($X_1$ و $X_2$) پێک هاتبێت بەدوورخستنەوەی هەردوو گۆڕاو ($X_3$ و $X_4$) هێمای ($r_{12.34}$) وەردەگرێت، کەدەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت:-

$$r_{12.34}=\frac{r_{12.3}-r_{14.3}r_{24.3}}{\sqrt{\left(1-r_{14.3}^{2}\right)\left(1-r_{24.3}^{2}\right)}} \quad \cdots \quad (6.8)$$

کەبریتییە لە($r_{12.3}$ و $r_{23.4}$ و $r_{14.3}$) پێکەوەلکانی بەشی، کەدەتوانرێت لەمیانەی دەقی(6.7) بەدەست بهێنرێت، بەهەمان شێوە... بۆ دوورخستنەوەی($k$) لەگۆڕاوەکان واتە( $r_{12.3}$ ....... $k$).

**نموونە**( 5.6 ):- گریمان($X_1$) بریتییە لەخەرجی مانگانەی خێزان و($X_2$)بریتییە لەداهاتی مانگانەو($X_3$) بریتییە لەژمارەی ئەندامانی خێزان، لەسەر بنچینەی بژاردەی ڕەمەکی(8) خێزان بەدەست هاتووە، ئەمەش داتاکانە:-

| ژمارەی ئەندامانی خێزان $x_3$ | داهاتی مانگانە $x_2$ | خەرجی مانگانە $x_1$ |
|---|---|---|
| 3 | 400 | 300 |
| 5 | 900 | 700 |
| 2 | 500 | 250 |
| 6 | 950 | 850 |
| 5 | 800 | 650 |
| 4 | 600 | 540 |
| 2 | 300 | 200 |
| 3 | 500 | 450 |

**داواكاری بریتییەلە :-**

1. دۆزینەوەی پێكەوەلكانی بەشەكی لەنێوان($X_1$ و $X_2$) بەدوورخستنەوەی كارێگاریی گۆڕاوی ($X_3$).

2. دۆزینەوەی پێكەوەلكانی بەشەكی نێوان($X_2$ و $X_3$) بەدوورخستنەوەی كارێگاریی($X_1$).

3. دۆزینەوەی پێكەوەلكانی نێوان($X_1$ و $X_3$) بەدوورخستنەوەی كارێگاریی($X_2$).

**شیكار** :- بۆ دۆزینەوەی پێكەوەلكانی نێوان هەردوو گۆڕاو بەدوورخستنەوەی كارێگاریی گۆڕاوی سێیەم، یەكەمجار دەبێ پێكەوەلكانی هێڵی سادە لەنێوان دوو گۆڕاو هەژمار دەكەین، واتە($r_{12}$ و $r_{13}$ و $r_{23}$)، بەم شێوەی خوارەوە:-

$$r_{12}=\frac{s_{x_1x_2}}{s_{x_1}s_{x_2}}=\frac{53360.7622}{(233.3452)(238.9523)}=0.957$$

$$r_{13}=\frac{s_{x_1x_3}}{s_{x_1}s_{x_3}}=\frac{340.6205}{(233.3452)(1.488)}=0.981$$

$$r_{23}=\frac{s_{x_2x_3}}{s_{x_2}s_{x_3}}=\frac{333.8718}{(238.9523)(1.488)}=0.939$$

1- بۆدۆزینەوەی پێكەوەلكانی نێوان ($X_1$ و $X_2$) بەدوورخستنەوەی كارێگاریی گۆڕاوی ($X_3$) ئەمەی خوارەوەمان هەیە:-

$$r_{12.3}=\frac{r_{12}-r_{13}'r_{23}}{\sqrt{(1-r_{13}^2)(1-r_{23}^2)}}=\frac{0.957-(0.981)\cdot(0.939)}{\sqrt{(1-0.981^2)(1-0.939^2)}}$$

$$=\frac{0.0358}{\sqrt{(0.0376)(0.1183)}}=\frac{0.0358}{0.0667}=0.5368$$

ئەمەش مانای وایە کەپێکەوەلکانێکی ڕاستەوانەی بەهێز هەیەو یەکسانەبە(53.68٪) لەنێوان خەرجی مانگانەو داهاتی مانگانەی خێزان بەدوورخستنەوەی کارێگاریی گۆڕاوی ژمارەی ئەندامانی خێزان.

2- دۆزینەوەی پێکەوەلکانی بەشەکی نێوان($X_2$ و $X_3$) بەدوورخستنەوەی کارێگاریی($X_1$) ئەمەی خوارەوەمان هەیە.

$$r_{23.1}=\frac{r_{23}-r_{12}r_{13}}{\sqrt{\left(1-r_{12}^2\right)\left(1-r_{13}^2\right)}}=\frac{0.939-(0.957)\cdot(0.981)}{\sqrt{\left(1-0.957^2\right)\left(1-0.981^2\right)}}$$

$$\therefore\quad r_{23.1}=\frac{0.000183}{\sqrt{(0.0842)(0.0376)}}=\frac{0.000183}{0.0563}=0.0033$$

ئەمەش مانای بوونی پێکەوەلکانی ڕاستەوانەی لاواز دەگەیەنێت یەکسانە بە(0.33٪) لەنێوان داهاتی مانگانەی خێزان و ژمارەی ئەندامانی خێزان، بەدوورخستنەوەی کارێگاریی گۆڕاوی خەرجی مانگانەی خێزان.

3- دۆزینەوەی پێکەوەلکانی نێوان($X_1$ و $X_3$) بەدوورخستنەوەی کارێگاریی($X_2$) بەم شێوەی خوارەوە :-

$$r_{13.2}=\frac{r_{13}-r_{12}r_{23}}{\sqrt{\left(1-r_{12}^2\right)\left(1-r_{23}^2\right)}}=\frac{0.981-(0.957)\cdot(0.939)}{\sqrt{\left(1-0.957^2\right)\left(1-0.939^2\right)}}$$

$$\therefore\quad r_{13.2}=\frac{0.0824}{\sqrt{(0.0842)(0.1183)}}=\frac{0.0824}{0.0998}=0.8257$$

ئەمەش مانای بوونی پێکەوەلکانی ڕاستەوانەی بەهێز دەگەیەنێت و یەکسانەبە(82.57٪) لەنێوان خەرجی مانگانەو ژمارەی ئەندامانی خێزان بەدوورخستنەوەی کارێگاریی گۆڕاوی داهاتی مانگانەی خێزان.

**نموونە**( 6.6 ):- .

پێکەوەلکانی نێوان($X_1$ و $X_2$) بەدوورخستنەوەی کارێگاریی($X_3$ و $X_4$) بدۆزەرەوە، ئەگەر بێتو ئەم زانیارییانەی خوارەوەت هەبێت:-

| | | |
|---|---|---|
| $r_{12.3} = 0.903$ | $r_{14.3} = 0.302$ | $r_{24.3} = 0.216$ |

**شیکار:-**

$$r_{12.34} = \frac{r_{12.3} - r_{14.3} r_{24.3}}{\sqrt{\left(1 - r_{14.3}^2\right)\left(1 - r_{24.3}^2\right)}}$$

$$= \frac{0.903 - (0.302)(0.216)}{\sqrt{\left(1 - 0.302^2\right)\left(1 - 0.216^2\right)}}$$

$$= \frac{0.8378}{\sqrt{(0.9088)(0.9533)}} = \frac{0.8378}{0.9308} = 0.90$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپێکەوەلکانی ڕاستەوانەی بەهێز هەیەو یەکسانەبە(90٪) لەنێوان ($X_1$ و $X_2$) بەدوورخستنەوەی هەردووگۆڕاوی ($X_3$ و $X_4$).

## 5.6:- هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی فرەیی :- Multiple Correlation Coefficient

زۆر جار تێبینی ئەوە دەکەین، ئەو گۆڕانەی کە لەدیاردەیەك ڕوودەدات، ڕەنگە بەهۆی گۆڕانی کۆمەڵێك دیاردەی دیکە بەیەکەوەبێت، نەك بەهۆی تاکە دیاردەیەکەوە، وەك کاتێك لێکۆڵینەوە لەهاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە دەکەین. لەسەر ئەم بنچینەیەدا، ئەوا گۆڕان لەخەرجییەکان ڕەنگە بەهۆی گۆڕانی داهات و سەرباری گۆڕان لەژمارەی ئەندامانی خێزانەوە بێت، هەروەها گۆڕان لەبەرهەمداری دۆنمێك لەگەنم یان جۆ ڕەنگە کارێگاربێت بەگۆڕان لەجۆری تۆی باشی و گۆڕان لەبڕی بارانی ساڵانەو گۆڕان لەڕێژەی خوێ لەزەویدا...هتد بێت. بۆیە دەتوانین پێناسەی پێکەوەلکانی فرەیی بەوە بکەین، کە بریتییە لە پێوانەکردنی هێزی پەیوەندی نێوان گۆڕاوێك لەلایەك و ژمارەیەك گۆڕاوی تر لەلایەکی دیکە(زیاترلەگۆڕاوێك) لەلایەکی دیکە، بۆنموونە هێمای ($r_{1.23}$)

بۆدادەنرێت، ئەمەش مانای پێکەوەلکانی فرەیی بژاردەیەکە لەنێوان گۆڕاوی($X_1$) لەگەڵ هەریەك لە گۆڕاوی دووەم و سێیەم بەیەکەوە بێت، یان($r_{1.234}$) مانای پێکەوەلکانی بژاردەیەکە لەنێوان گۆڕاوی($X_1$) لەگەڵ سێ گۆڕاوی دیکەی بەیەکەوە دەگەیەنێت بەهەمان شێوە تا($r_{1.23......k}$)، کەمانای پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان($X_1$) لەگەڵ($k$) لەگۆڕاوەکانی دیکە بەیەکەوە دەگەیەنێت. دەتوانرێت پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان($X_1$) لەلایەك و($X_2$) سەرباری ($X_3$) لەلایەکی دیکە هەژماربکرێت ، ئەویش بەپشت بەستن بەم دەقەی خوارەوە:—

$$r_{1.23}=\sqrt{\frac{r_{12}^2+r_{13}^2-2\,r_{12}\cdot r_{13}\cdot r_{23}}{1-r_{23}^2}}\quad ;\quad r_{23}\neq\mp1\quad\cdots\quad(6.9)$$

هەروەهادەتوانرێت هەژماری پێکەوەلکانی بەشەکی بەم شێوەی خوارەوە بکرێت:—

$$r_{1.23}=\sqrt{1-\left(1-r_{12}^2\right)\left(1-r_{13.2}^2\right)}\qquad\cdots\quad(6.10)$$

دەتوانرێت هەژماری($r_{1.234}$) لەپێکەوەلکانی بەشەکی لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە بکرێت:—

$$r_{1.234}=\sqrt{1-\left(1-r_{12}^2\right)\left(1-r_{13.2}^2\right)\left(1-r_{14.23}^2\right)}\qquad\cdots\quad(6.11)$$

بەهەمان شێوەتادەگاتە($r_{1.23.....k}$)، دەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت :—

$$r_{1.234}=\sqrt{1-\left(1-r_{12}^2\right)\left(1-r_{13.2}^2\right)\left(1-r_{14.23}^2\right)\cdots\left(1-r_{1k.23\cdots k-1}^2\right)}\quad\cdots\quad(6.12)$$

**نموونە**( 7.6 ):- بەپشت بەستن بەنموونەی(5.6) هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان($X_1$) لەلایەك و ($X_2$) و($X_3$) لەلایەکی دیکە بدۆزەرەوە، هەروەها هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان($X_1$) لەلایەك و ($X_2$) و ($X_3$) لەلایەکی دیکەبدۆزەرەوە، هەروەها هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان($X_2$) لەلایەك و ($X_1$) و ($X_3$) لەلایەکی دیکە بدۆزەرەوە.

**شیکار** :- لەمیانەی نموونەی(5.6) ئەمانەی خوارەوەمان هەیە:-

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| $r_{23.1} = 0.0033$ | $r_{13.2} = 0.8257$ | $r_{23} = 0.939$ | $r_{13} = 0.981$ | $r_{12} = 0.957$ |

پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان خەرجی مانگانە لەلایەك و داهاتی مانگانەو ژمارەی ئەندامانی خێزان لەلایەکی دیکە دەتوانرێت لەمیانەی ئەمانەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت:-

$$r_{1.23} = \sqrt{\frac{r_{12}^2 + r_{13}^2 - 2 r_{12} \cdot r_{13} \cdot r_{23}}{1 - r_{23}^2}}$$

$$= \sqrt{\frac{0.957^2 + 0.981^2 - 2(0.957)(0.981)(0.939)}{1 - 0.939^2}}$$

$$= \sqrt{\frac{0.1151}{0.1183}} = 0.9865$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپێکەوەلکانی راستەوانەی بەهێز کەیەکسانە بە(98.65٪) لەنێوان خەرجی مانگانەی خێزان لەلایەك و داهاتی مانگانەی خێزان و ژمارەی ئەندامانی خێزان لەلایەکی دیکە هەیە.

دەتوانرێت لەمیانەی پێکەوەلکانی بەشەکی هەژماربکرێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$r_{1.23} = \sqrt{1 - (1 - r_{12}^2)(1 - r_{13.2}^2)}$$

$$= \sqrt{1 - (1 - 0.957^2)(1 - 0.8257^2)}$$

$$= \sqrt{1 - (0.0842)(0.3182)} = 0.9865$$

دەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە هەژماربکرێت :-

$$r_{2.13} = \sqrt{1-\left(1-r_{12}^2\right)\left(1-r_{23.1}^2\right)}$$
$$= \sqrt{1-\left(1-0.957^2\right)\left(1-0.0033^2\right)}$$
$$= \sqrt{1-\left(0.0842\right)\left(0.99999\right)} = 0.957$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپێکەوەلکانێکی ڕاستەوانەی بەهێز هەیە، کەیەکسانە بە(95.7٪) لەنێوان داهاتی مانگانەی خێزان لەلایەك و لەلایەکی دیکە خەرجی مانگانەی خێزان و ژمارەی ئەندامانی خێزان لەلایەکی دیکەوە.

نموونە(8.6):– ئەمانەی خوارەوە داتایە لەبارەی بەرهەمداری دۆنمێك لە گەنم($X_1$)و بڕی تۆی بەکارهێنراو ($X_2$) وبڕی باران و($X_3$) ڕێژەی خوێ لەزەوی($X_4$):–

| $x_4$ | $x_3$ | $x_2$ | $x_1$ |
|---|---|---|---|
| 4 | 82 | 67 | 23 |
| 3 | 98 | 89 | 34 |
| 2 | 108 | 99 | 42 |
| 5 | 88 | 83 | 35 |
| 1 | 110 | 100 | 60 |
| 2 | 102 | 90 | 45 |

**داواکاری بریتییەلە** :-

1– پێکەوەلکانی هێڵی سادە هەژمار بکە لەنێوان بڕی بەرهەمداری یەك دۆنم و بڕی تۆی بەکارهێنراو.

2– پێکەوەلکانی بەشەکی لەنێوان بڕی بەرهەمداری یەك دۆنم و بڕی تۆی بەکارهێنراو بەدوور خستنەوەی کاریگەری بڕی بارانی ساڵانە هەژمار بکە.

3– پێکەوەلکانی بەشەکی لەنێوان بڕی بەرهەمداری یەك دۆنم و بڕی تۆی بەکارهێنراو بەدوورخستنەوەی کاریگەری بڕی بارانی ساڵانەو ڕێژەی خوێ لەزەویدا هەژمار بکە.

4– پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان بڕی بەرهەمداری یەك دۆنم لەلایەك و بڕی تۆی بەکارهێنراو و بڕی بارانی ساڵانەو ڕێژەی خوێ لەزەوی لەلایەکی دیکە هەژمار بکە.

**شیکار :-**

1- هەژمارکردنی($r_{12}$) بەم شێوەیە :-

| $x_4$ | $x_3$ | $x_2$ | $x_1$ |
|---|---|---|---|
| 4 | 82 | 67 | 23 |
| 3 | 98 | 89 | 34 |
| 2 | 108 | 99 | 42 |
| 5 | 88 | 83 | 35 |
| 1 | 110 | 100 | 60 |
| 2 | 102 | 90 | 45 |

ئەمەش مانای ئەوەیە کە پێکەوەلکانێکی راستەوانەی بەهێز لەنێوان بڕی بەرهەمداری یەك دۆنم و بڕی تۆی بەکارهێنراو دا هەیە، کەیەکسانە بە(85.6٪)

2- هەژمارکردنی($r_{1.23}$) ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

یەکەمجار پێویستی مان بە هەژمارکردنی ($r_{13}$ و $r_{23}$) هەیە:-

$$r_{13} = \frac{s_{x_1x_3}}{s_{x_1}s_{x_3}} = \frac{120.3832}{(12.4807)(11.0996)} = 0.869$$

$$r_{23} = \frac{s_{x_2x_3}}{s_{x_2}s_{x_3}} = \frac{129.5497}{(12.1326)(11.0996)} = 0.962$$

بۆیە:-

$$r_{12.3} = \frac{r_{12} - r_{13}r_{23}}{\sqrt{(1-r_{13}^2)(1-r_{23}^2)}} = \frac{0.856-(0.869)\cdot(0.962)}{\sqrt{(1-0.869^2)(1-0.962^2)}}$$

$$= \frac{0.02}{\sqrt{(0.2448)(0.0746)}} = \frac{0.02}{0.1351} = 0.148$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپێکەوەلکانی ڕاستەوانەی لاواز یەکسانە بە (٪ 14.8) لەنێوان بەرهەمداری یەك دۆنم لەزەوی لەگەڵ بڕی تۆی بەکارهێنراو بەدوورخستنەوەی کارپێگەری بڕی بارانی ساڵانە هەیە.

3- هەژمارکردنی($r_{12.34}$) بەم شێوەی خوارەوەیە، سەرەتا پێویستمان بەهەژمارکردنی($r_{14.3}$) و($r_{24.3}$) هەیە:-

$$r_{14.3} = \frac{r_{14} - r_{13}r_{43}}{\sqrt{\left(1-r_{13}^2\right)\left(1-r_{43}^2\right)}} = -0.096$$

$$r_{24.3} = \frac{r_{24} - r_{23}r_{43}}{\sqrt{\left(1-r_{23}^2\right)\left(1-r_{43}^2\right)}} = 0.958$$

بۆیە:-

$$r_{12.34} = \frac{r_{12.3} - r_{14.3}r_{24.3}}{\sqrt{\left(1-r_{14.3}^2\right)\left(1-r_{24.3}^2\right)}}$$

$$= \frac{0.148-(-0.096)(0.958)}{\sqrt{\left(1-(-0.096)^2\right)\left(1-0.958^2\right)}}$$

$$= \frac{0.24}{\sqrt{(0.9908)(0.0822)}} = \frac{0.24}{0.2854} = 0.841$$

ئەمەش مانای ئەوەیە کەپێکەوەلکانێکی ڕاستەوانەی بەهێز کە یەکسانە بە (84.1 ٪) لەنێوان بڕی بەرهەمداری یەك دۆنم و بڕی تۆی بەکارهێنراو هەیە بەدوورخستنەوەی کاریگەری هەردوو گۆڕاوی بڕی بارانی ساڵانەو ڕێژەی خوێ لەزەویدا.

4- هەژمارکردنی ($r_{1.234}$) بەم شێوەی خوارەوە:-

یەکەمجار پێویستمان بەهەژمارکردنی($r_{13.2}$) و($r_{14.23}$) دەبێت:-

$$r_{1.234} = \sqrt{1-\left(1-r_{12}^2\right)\left(1-r_{13.2}^2\right)\left(1-r_{14.23}^2\right)}$$

$$= \sqrt{1-\left(1-0.856^2\right)\left(1-0.323^2\right)\left(1-(-0.826)^2\right)}$$

$$= \sqrt{1-(0.2673)(0.8957)(0.3177)} = \sqrt{0.9239} = 0.961$$

ئەمەش مانای بوونی پێکەوەلکانی ڕاستەوانەی بەهێز لەنێوان بڕی بەرهەمداری یەك دۆنم لەگەنم لەلایەك و بڕی تۆی بەکارهێنراو و بڕی بارانی ساڵانەو ڕێژەی خوێ لەزەوی بەیەکەوە لەلایەکی دیکەوە هەیە، کەیەکسانە بە(96.1٪).

## 6.6 :- پێکەوەلکانی خەسڵەتەکان :- Correlation between Attributes

بریتییە لەو پێکەوەلکانەی کە پاڵپشتە بەبوونی دابەشکردنی دووبارەیی جووتە بۆ دوو گۆڕاو لەجۆری باسەنی(یەکێکیان یان هەردووکیان لەجۆری باسەنینە) بۆیە ناتوانرێت هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی سپێرمان بەکاربهێنرێت(چونکە شایستەی ڕیزبەندی بەشێوەی بەرزبۆوە یان نزم بۆوە نییە) هەر بۆیە پێویستمان بەپێوەرێکی دیکە دەبێت، بۆئەم دۆخە وەک هاوکۆلکەی هاوکۆک یان هاوکۆلکەی نزیک بوون(هەروەها پێوەری دیکەش کەلێرەدا بوار نییە باسیان بکەین)، ئەمەش بەم شێوەی خوارەوەیە:—

### أ- هاوکۆلکەی هاوکۆک :- Coefficient of Contingency

دەتوانرێت هاوکۆلکەی هاوکۆک بۆ داتا ڕیزکراوە باسەنییەکان، کەشایستەی ڕیزبەندی نییە بدۆزرێتەوە، ئەویش لەمیانەی دروست کردنی ئەم خشتە هاوکۆکییەی خوارەوە:—

| ئاستەکان | | ئاستەکان y | | | | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | $y_1$ | $y_2$ | $\cdots$ | $y_m$ | سەرجەم |
| ئاستەکان x | $x_1$ | $f_{11}$ | $f_{12}$ | $\cdots$ | $f_{1m}$ | $T_{1.}$ |
| | $x_2$ | $f_{21}$ | $f_{22}$ | $\cdots$ | $f_{2m}$ | $T_{2.}$ |
| | $\vdots$ | $\vdots$ | $\vdots$ | $\vdots$ | $\vdots$ | $\vdots$ |
| | $x_k$ | $f_{k1}$ | $f_{k2}$ | $\cdots$ | $f_{km}$ | $T_{k.}$ |
| سەرجەم | | $T_{.1}$ | $T_{.2}$ | $\cdots$ | $T_{.m}$ | $T_{km} = n$ |

بەمەش دەتوانین هاوکۆلکەی هاوکۆک (C) بەپشت بەستن بەپۆلی ئاسۆیی یان پۆلی ستوونی لەخشتەی هاوکۆک بەدەست بهێنین ئەویش لەڕێگای ئەم دەقەی خوارەوە :—

$$C = \sqrt{\frac{r-1}{r}} \qquad \cdots \quad (6.13)$$

کە(r) دەتوانرێت بەدەستی بهێنین لەمیانەی کۆکردنەوەی بەهای ئاسۆیی، واتە:—

$$r=\sum_{j=1}^{k} r_j$$

هەروەها بەهای($r_j$) بەدەست دەهێنرێت، لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە:-

$$r_j=\frac{1}{T_{j.}}\sum_{i=1}^{m}\frac{f_{ji}^2}{T_{.i}} \qquad \cdots \quad (6.14)$$

**نموونە**(9.6 ):ئەم خشتەیەی خوارەوە ژمارەی ڕووداوەکانی **هاتووچۆ** دیاری دەکات، کەلەیەکێك لەشارەکان ڕوویداوە، ئەویش لەمیانەی ماوەیەکی زەمینیدا، کەدابەشبووە بەپێ ی ڕووداو و دۆخی کەش و هەوا، داواکاری هەژماری هاوکۆلکەی هاوکۆك بکە؟

| جۆری کەش و هەوا / جۆری ڕووداو | دهس | بەریەککەوتن | وەرگەڕان | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|
| ڕۆژی ئاسایی | 15 | 8 | 5 | 28 |
| باراناوی | 5 | 25 | 15 | 45 |
| تەماوی | 10 | 23 | 20 | 53 |
| سەرجەم | 30 | 56 | 40 | 126 |

**شیکار** :- یەکەمجار هەژماری بەهای($r_j$) دەکەین لەدەقی(6.14) ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

$$r_j=\frac{1}{T_{j.}}\sum_{i=1}^{m}\frac{f_{ji}^2}{T_{.i}}$$

$$r_1=\frac{1}{T_{1.}}\sum_{i=1}^{3}\frac{f_{1i}^2}{T_{.i}}=\frac{1}{28}\left(\frac{15^2}{30}+\frac{8^2}{56}+\frac{5^2}{40}\right)=\frac{9.2679}{28}=0.331$$

$$r_2=\frac{1}{T_{2.}}\sum_{i=1}^{3}\frac{f_{2i}^2}{T_{.i}}=\frac{1}{45}\left(\frac{5^2}{30}+\frac{25^2}{56}+\frac{15^2}{40}\right)=\frac{17.619}{45}=0.3915$$

$$r_3=\frac{1}{T_{3.}}\sum_{i=1}^{3}\frac{f_{3i}^2}{T_{.i}}=\frac{1}{53}\left(\frac{10^2}{30}+\frac{23^2}{56}+\frac{20^2}{40}\right)=\frac{22.7798}{53}=0.4298$$

بۆیە:-

$$r = \sum_{j=1}^{k} r_j = r_1 + r_2 + r_3 = 0.331 + 0.3915 + 0.4298 = 1.1523$$

ئەوا هاوکۆلکەی هاوکۆك بەدەست دەهێنرێت لەمیانەی(6.13)، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$C = \sqrt{\frac{r-1}{r}} = \sqrt{\frac{1.1523-1}{1.1523}} = 0.3636$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەڕێژەی هاوکۆك. بریتییەلە(36.36٪) لەنێوان دۆخی کەش و هەواو جۆری ڕوودوادەکە.

**تێبینی** :- بەهای هاوکۆلکەی هاوکۆك دەکەوێتە نێوان سفر و ژمارە(1) یەك، ناتوانرێت هەژمار بکرێت کاتێك بەهای(C) دەکەوێتە نێوان سفر و (1) یەك.

## ب- **هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون** :- Coefficient of Association دوو

دۆخمان لەکردەی هەژمارکردنی هەیە، ئەوانیش بریتییەلە:-

**یەکەم** :- **لەدۆخی بوونی دووئاست بۆهەریەك لەگۆڕاویکدا** :-

هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون پێوانەی پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاوو دوو ڕیزی ئاسۆیی کەناتوانرێت ریزبەند بکرێت دەکات(یان ڕەنگە یەکێکیان یان هەردووکیان شایستەی ریزبەندی بن) داتاکانیان لەخشتەی بەقەبارەی(2*2) بەتاڵ دەکرێت.بۆنموونە ڕەگەزی (کوڕوکچ)، توانستی بەجێهێنانی کار(باش،خراپ) خشتەی هاوکۆك بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:-

| ئاستەکان | | ئاستەکان y | | |
|---|---|---|---|---|
| | | $y_1$ | $y_2$ | سەرجەم |
| ئاستەکان x | $x_1$ | $f_{11}$ | $f_{12}$ | $f_{1.}$ |
| | $x_2$ | $f_{21}$ | $f_{22}$ | $f_{2.}$ |
| | سەرجەم | $f_{.1}$ | $f_{.2}$ | n |

بەپشت بەستن بەخشتەی هاوکۆك هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە دەردەهێنرێت:-

$$C.A_2 = \frac{f_{11} \cdot f_{22} - f_{12} \cdot f_{21}}{f_{11} \cdot f_{22} + f_{12} \cdot f_{21}} \quad \cdots \quad (6.15)$$

**نموونە**( 10.6 ): ئەم خشتەی خوارەوە ژمارەی کورو کچە بەژداربووەکانی توانستی وانەبێژی ڕوون دەکاتەوە. داواکاری هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون لەنێوان ڕەگەزو توانستی وانەبێژی هەژمار بکە :-

| ڕەگەز | توانستی وانەبێژ | باشە | خراپە | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|
| نێر | | 40 | 25 | 65 |
| مێ | | 30 | 15 | 45 |
| سەرجەم | | 70 | 40 | 110 |

**شیکار** :- دەتوانرێت هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون لەمیانەی دەقی(6.15) هەژمار بکرێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$C.A_2 = \frac{f_{11} \cdot f_{22} - f_{12} \cdot f_{21}}{f_{11} \cdot f_{22} + f_{12} \cdot f_{21}}$$

$$= \frac{(40)(15) - (25)(30)}{(40)(15) + (25)(30)} = \frac{-150}{1350} = -0.1111$$

ئەمەش مانای ئەوەیە کەپێکەوەلکانی پێچەوانەیی لاواز لەنێوان ڕەگەزو توانستی وانەبێژی هەیە.

**تێبینی** :- بەهای هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون دەکەوێتە نێوان(1 و 1-).

**دووەم :- لەدۆخی بوونی دووئاست یان زیاتر بۆهەریەکێك لەگۆڕاوەکان :-**

دەتوانرێت هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون هەژمار بکرێت بەپشت بەستن بەخشەی هاوکۆك(kxm) کەلەسەرەوە ڕوون کراوەتەوە، ئەویش لەمیانەی جێ بەجێ ئەم دەقەی خوارەوە:-

$$C.A_G = \frac{\sum_{i=1}^{m} f'_{ij} + \sum_{j=1}^{k} f''_{ij} - T'_{.i} - T'_{j.}}{2n - \left(T'_{.i} + T'_{j.}\right)} \quad \cdots \quad (6.16)$$

**کە** :-

- $f'_{ij}$ :- بریتییە لە گەورەترین دووبارەیی ئەو ستوونە .
- $f''_{ij}$ :- بریتییە لە گەورەترین دووبارەیی لەئاسۆیی.
- $T'_{.i}$ :- بریتییە لە گەورەترین سەرجەم لەنێو سەرجەمەکانی ریزی ستوون.
- $T'_{j.}$ :- بریتییە لە گەورەترین سەرجەم کەلەنێو سەرجەمەکانی ریزی ئاسۆیی

**نموونە**( 11.6 ) :- ئەم داتایانەی خشتەی هاوکۆك لەنموونەی(9.6)، هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون بدۆزەرەوە.

**شیکار** :- دەست بەدروست کردنی ئەم خشتەیە دەکەین:-

| دۆخی کەش و هەوا | جۆری ڕووداو | دەس | بەریەککەوتن | وەرگەران | سەرجەم | گەورەترین دووبارە لە ستوون | گەورەترین سەرجەم لە ئاسۆیی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆژی ئاسایی | | 15 | 8 | 5 | 28 | 15 | --- |
| باراناوی | | 5 | 25 | 15 | 45 | 25 | --- |
| تەماوی | | 10 | 23 | 20 | 53 | 23 | 53 |
| سەرجەم | | 30 | 56 | 40 | 126 | 63 | --- |
| گەورەترین دووبارە لە ستوون | | 15 | 25 | 20 | 60 | | |
| گەورەترین دووبارە لە ئاسۆیی | | --- | 56 | --- | --- | | |

لەمیانەی خشتەی هاوکۆك و جێ بەجێ کردنی دەقی(6.16) هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون بەم شێوەی خوارەوە بەدەست دەهێنین:-

$$C.A_G = \frac{\sum_{i=1}^{m} f'_{ij} + \sum_{j=1}^{k} f''_{ij} - T'_{.i} - T'_{j.}}{2n - \left(T'_{.i} + T'_{j.}\right)}$$

$$= \frac{60 + 63 - 56 - 53}{2(126) - (56 + 53)} = \frac{14}{143} = 0.0979$$

هەروەها جۆری دیکە لەهاوکۆلکەی هاوکۆك و لێکنزیکبوونی سێ ئاراستەو چوار ئاراستەو...هتد وەردەگرێت. کەبوار نییە لەم کتێبەدا ئاماژەی پێ بکرێت.

# ڕاهێنانی بەشی شەشەم

**1.6:-** مەبەست لەهاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە چییە؟

**2.6:-** هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان داهات و خەرجییەکان لەمیانەی ماوەیەکی دیاریکراو لەفەرمانگەی کارەبای هەولێر بدۆزەرەوە ئەویش لەمیانەی ئەم خشتەی خوارەوە:-

| داهات | 23 | 34 | 46 | 33 | 50 | 55 | 66 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| خەرجییەکان | 12 | 25 | 30 | 22 | 35 | 40 | 45 |

**3.6:-** هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان توانستی پەرستیار لەمیانەی تاقی کردنەوە بۆحەوت پەرستیار لەبەرامبەر ژمارەی ساڵەکانی شارەزایی بدۆزەرەوە ئەویش بەم شێوەی خوارەوەیە:-

| توانستی x | نایاب | باشە | زۆرباشە | لاواز | زۆرباشە | ناوەند | پەسەند |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ساڵەکانی شارەزاییy | 20 | 15 | 18 | 7 | 12 | 12 | 12 |

**4.6:-** هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان ئەنجامی تاقی کردنەوەی توانستی زمانی ئینگلیزی و ئاستی خوێندن بۆشەش پێشکەشکاری کارکردن بدۆزەرەوە کەبەم شێوەی خوارەوەیە:-

| توانستی x | ناوەند | زۆرباشە | لاواز | باشە | نایاب | پەسەند |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاستی خوێندنy | سەرەتایی | ناوەندی | ئامادەیی | ماستەر | دکتۆرا | بەکالۆریۆس |

**5.6:-** ئەم خشتەی خوارەوە داتاکانی پێنج بەرێوبەر دیار دەکات کەبریتییەلە نازناوی کارکردن( A )و لێهاتووی زانستی( B )، شارەزایی زانستی( C ):-

| نازناوی کارکردن A | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 |
|---|---|---|---|---|---|
| لێهاتووی زانستی B | 3 | 4 | 2 | 1 | 5 |
| شارەزایی زانستی C | 2 | 4 | 9 | 13 | 12 |

**داواکاری بریتییەلە:**

1) هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی بەشەکی لەنێوان نازناوی کارکردن و لێهاتووی زانستی بەدوورخستنەوەی کارێگاریی شارەزایی زانستی بدۆزەرەوە.

2) هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی بەشەکی لەنێوان لێهاتووی زانستی وشارەزایی زانستی بەدوورخستنەوەی نازناوی کارکردن بدۆزەرەوە.

3) هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی بەشەکی لەنێوان نازناوی کارکردن و شارەزایی زانستی بەدوورخستنەوەی کارێگاریی لێهاتوویی زانستی بدۆزەرەوە.

**6.6** :- ئەگەر ئەم داتایانەی خوارەوەت هەبێت:-

| X | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 |
|---|---|---|---|---|---|
| Y | 6 | 4 | 2 | 0 | 2- |
| Z | 20 | 34 | 42 | 65 | 78 |
| V | 0 | 3- | 2 | 5- | 1 |

ئەمانەخوارەوە بدۆزەرەوە:-

| 1 | 2 | 3 |
|---|---|---|
| $r_{xy.zv}$ | $r_{xz.yv}$ | $r_{vz.xy}$ |

**7.6** :- ئەمەی خوارەوە ئەنجامی ئەزموونی دوو جۆر تۆی چاندنەو کارپێگەری لەزیدبوونی بڕی بەرهەمی تەماتە هەیە، بەگریمانی چەسپاوی بارودۆخی ئەزموونگەری دیکەلە(200) پارچە زەوی کشتوکاڵی دیکە:-

| بڕی بەرهەم / جۆری تۆی چاندن | باوەڕپێکراو | ئاسایی |
|---|---|---|
| **لە سەرووی ناوەند** | 70 | 40 |
| **لە خوارووی ناوەند** | 55 | 35 |

**داواکاری :-** هەژماری هاکۆلکەی هاوکۆك و لێکنزیکبوون لەنێوان بڕی بەرهەم و جۆری تۆی چاندن بکە.

**8.6:-** ئەمەی خوارەوە دابەشکردنی دووبارەیی دوو لایەنەیە بۆ ژمارەی بوومە لەرزەکان، کەلەسەرانسەری جیهان لەماوەیەکی دیاریکراو ڕوویانداوەو دابەش بووە بەپێ ی هێزی بوومە لەرزەکە بەپێوەری ڕێختەر (کەلەنۆ پلە پێك هاتووە) و ئەو زیانانەی کەلەبوومەلەرزەکان بۆتەوە:-

| زیانەکان / پلە | کەمتر لە 5 | -5 | -6 | -7 | 8-9 |
|---|---|---|---|---|---|
| **کەم** | 12 | 4 | 2 | -- | -- |
| **مام ناوەند** | -- | 1 | 4 | 7 | -- |
| **گەورە** | -- | -- | 1 | 10 | 13 |

**داواکاری:-** هاوکۆلکەی هاوکۆك و لێکنزیکبوون لەنێوان هێزی بوومەلەرزەو ئەو زیانانەی لەبوومەلەرزەکە کەوتۆتەوە بدۆزەرەوە؟

## 1.7 :- پێشەکی :-

لەمەوپێش هاوکۆلکەی پێکەوەلکانمان باس کرد، کەپێوانەی بڕو ئاراستەی پێکەوەلکانی دوو گۆڕاو دەکات، بەلاّم ڕەنگە توێژەر پێویستی بەزانینی زیاتر لەپەیوەندی پێکەوەلکانەی ئەو دوو گۆڕاوە هەبێت، بۆنموونە ڕەنگە پێویستی بەپێشبینی کردن (Prediction) بۆ ڕەفتاری یەکێك لەگۆڕاوەکان هەبێت، ئەویش لە ڕوانگەی کاریگەربوون بەگۆڕاوێکی دیکە یان ژمارەیەك گۆڕاوی دیکە هەبێت، هەروەها ئەگەر بێتو ژمارەیەك گۆڕاومان هەبێت، ڕەنگە لای توێژەر ئارەزووی ئەوەی هەبێت تابزانێت مەودای کاریگەری هەر گۆڕاوێك لەگۆڕاوەکان لەسەر گۆڕاوەکانی دیکە چەند بێت، ئەو گۆڕاوەش کەتوێژەر ئارەزووی ئەوە دەکات لێکۆڵینەوە لەڕەفتارو زانینی مەودای کاریگەریی بەگۆڕاوەکانی دیکە بکات ئەمەش پێ ی دەگوترێت گۆڕاوی ناسەربەخۆ، هەروەها گۆڕاوی دیکە، کەکاریگەری لەسەر ڕەفتاری گۆڕاوی ناسەربەخۆ (Dependent Variable) هەیە، کەپێ ی دەگوترێت گۆڕاوی سەربەخۆ (Independent Variable)، بۆیە شیکردنەوەی لاریبوون پشت بەبوونی گۆڕاویکی ناسەربەخۆ و گۆڕاوێك یان ژمارەیەك گۆڕاوی سەربەخۆ هەیە.

## 2.7 :- ئامانجەکانی شیکردنەوەی لارییوون :-

1- لێکۆڵینەوە لەپەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو لەسەر شێوەی پەیوەندی دالی دەکات، بەجۆرێك دەتوانرێت گۆڕانی یەکێکیان لەسەر بنچینەی کاریگەری ئەوی تر بزانرێت، واتە لێکۆڵینەوە بۆ ئامانجی پێشبینی کردنی ڕەفتاری گۆڕاوی ناسەربەخۆیە لەڕوانگەی کاریگەریی بەگۆڕاوێك یان گۆڕاوە سەربەخۆکانەوە دەکات، واتە دەتوانرێت پێشبینی گۆڕانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ لەسەر بنچینەی زانینی گۆڕان لەگۆڕاوە سەربەخۆکان بکرێت ئەو پەیوەندییە دالیەش بەشێوەی خوارەوە دەنوسرێت :-

$$y = f(x)$$

2- ئەوە دەداتە دەستەوە، کەمەودای پشکداری هەر گۆڕاوێکی سەربەخۆ لەمەودای جیاکاری دایە، یان گۆڕانکاری دروست بوو لەگۆڕاوی ناسەربەخۆدا .

3- پێوانەکردنی مەودای پێکەوەلکانی هەمووەکی لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆو گۆڕاوە سەربەخۆکانەوەیە.

4- ئەنجامدانی زنجیرەیەك لەئەزموونی گریمانی بۆ هەر یەك لەو پەیوەندییانەی کە لەخاڵەکانی پێشوو ئاماژەی پێکراوە.

**تێبینی** :- پێویستە جیاوازی لەنێوان شیکردنەوەی پێکەوەلکان و شیکردنەوەی لاریبوون بکرێت، بۆ ئەوەی تێکەڵی لەنێوانیان دروست نەبێت. سەرەڕای بوونی بەیەکچوون لەنێوان پەیوەندی ماتماتیکی لەنێوانِ پێکەوەلکان و لاریبوون، بەلاّم جیاوازییان لەم خالاّنەی خوارەوە لێ دەبینرێت :-

1- مەرجی ئەوە لەشیکردنەوەی لاریبوون هەیە، کەپەیوەندی دالی لەنێوان گۆڕاوەکان هەیە، کەچی ئەو مەرجە لەشیکردنەوەی پێکەوەلکان نییە.

2- مەرجی ئەوە لەدۆخی پێکەوەلکان هەیە کەداتای هەموو گۆڕاوەکان دابەش کراوە بەشێوەی سروشتی، کەچی شیکردنەوەی لاریبوون ئەوەیە، کەبەهای گۆڕاوی ناسەربەخۆ دەبێ بەشێوەی سروشتی دابەش بکرێت.

3- شیکردنەوەی پێکەوەلکان بریتییە لەپێوەریکی باسەنی، کەچی شیکردنەوەی لاریبوون بریتییە لەپێوەرێکی ژمارەیی . لێرەدا نموونەی زۆرمان هەیە کەدەتوانرێت لەسەر بابەتی شیکردنەوەی لاریبوون جێ بە جێ بکرێت، وەك پەیوەندی نێوان بەرهەمی کشتوکاڵی و بڕی بارانی باریوو، واتە هەرکاتێك بڕی باران زیاد بکات، ئەوا پێشبینی زیاد بوونی بەرهەمی کشتوکاڵی دەکرێت. هەروەها لێکۆڵینەوە لەمەودای کاریگەری گۆڕان لەداهاتی مانگانەی خێزان لەسەر گۆڕان لەخەرجی مانکانەی خێزان دەکرێت، هەروەها لێکۆڵینەوە لەجگەرەکێشان و کاریگەریی لەسەر نەخۆشی سییەکان...هتد دەکرێت. سەبارەت بەجۆرەکانی لاریبوون ئەوا بریتییە لەلاریبوونی سادە(تاکە گۆڕاویکی سەربەخۆیە)و لاریبوونی فرەیی(زیاترە لەگۆڕاوێکی سەربەخۆ) ئەمەش دابەش دەبێت بۆ هێڵی(گۆڕاوێکی سەربەخۆیە کەئیسی یەکسانە بەیەك)، بەلاّم ناهێڵی(گۆڕاوێکی سەربەخۆیە کەئیسی یەکەی لەژمارە یەك گەورەترە یان لۆگاریتم دەبێت ...هتد).

## 3.7 :- لاریبوونی هێڵی سادە :- Simple Linear Regression

لاریبوونی هێڵی سادە بریتییە لەکردەی مەزەندەی پەیوەندی هێڵی لەنێوان دوو گۆڕاو یەکێکیان سەربەخۆو ئەوی تریان ناسەربەخۆیە. هەر وەکو لەم مۆدێلەی لاریبوون بەدیار دەکەوێت :

$$y_i = \beta_0 + \beta_1 x_i + \varepsilon_i \qquad \cdots \quad (7.1)$$

($y_i$) بریتییە لەبینەرەکانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ(وەك خەرجی مانگانەی خێزان)، لەبەرامبەر ئەوە دا($x_i$) بریتییە لەبینەرەکانی گۆڕاوی سەربەخۆ(وەك داهاتی مانگانەی خێزان)، هەروەها ($E_i$) بریتیە لەهەڵەی ڕەمەکی(پیویستە لەمۆدێلدا هەبێت، چونکە پەیوەندی تەواو لەنێوان هەر دوو گۆڕاودا نییە) ئەمەش بریتییە لەو گۆڕانانەی ڕوو دەدات لەگۆڕانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ لەئەنجامی کارێگاریی گۆڕاوەکانی دیکە(بێجگە لەگۆڕاوی سەربەخۆ)، کەلێکۆڵینەوەی لەبارەیەوە ناکرێت، هەروەها($B_0$) و ($B_1$) بریتییە لەنیشانەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە بۆ کۆمەڵگاو یەکێك لەڕێگاکانی مەزەندەکردن بۆ مەزەندەی نیشانەکانی هێلی لاریبوونی سادە بۆ بژاردە بەکار دەهێنرێت، وەك ڕێگای چوار لای بچووکی ئاسایی (OLS)، واتە مەزەندەی نیشانەکانی مۆدێل بەم شێوەیە دەبێت:

$$\hat{y}_i = \hat{\beta}_0 + \hat{\beta}_1 x_i \qquad \cdots \quad (7.2)$$

( $\hat{y}_i$ ) بریتییە لەبەهای مەزندەکراوی گۆڕاوی ناڕاستەوخۆ لەمیانەی مۆدێلی مەزندەکراوی سەرەوە ($B_0$ و $B_1$) کە بریتییە لە نیشانەی مۆدێلی مەزەندەکراوی بژاردە، کە دەتوانرێت لەمیانەی ئەم دوو دەقەی خوارەوە مەزەندە بکرێت:—

$$\hat{\beta}_1 = \frac{S_{xy}}{S_x^2} = \frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i - \bar{x})(y_i - \bar{y})}{\sum_{i=1}^{n}(x_i - \bar{x})^2} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i y_i - n\,\bar{x}\cdot\bar{y}}{\sum_{i=1}^{n} x_i^2 - n\,\bar{x}^2} \qquad \cdots \quad (7.3)$$

$$\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1 \bar{x} \qquad \cdots \quad (7.4)$$

ئەو دوو بەهایە باشترین هێڵی ڕاست لەنێو شێوەی بەربڵاوبوون دیاری دەکەن، کەگوزارشت لەپەیوەندی نێوان (X)و (Y) دەکات، خاڵی($B_0$) بریتییە لەخاڵی یەکتربڕی هێڵی لاریبوون لەگەڵ تەوەرەی ستوونی کەبریتییە لەگۆڕاوی (Y) یان بریتییە لەماوەی نێوان خاڵی بنەرەتی (0 و 0) ، خاڵی یەکتربڕی هێڵی لاریبوون لە تەوەرەی ستوونی، لەبەرامبەردا ( $\hat{\beta}_1$) بریتییە لەلادانی لاریبوون یان هاوکۆلکەی لاریبوون واتە پێوەرێکە بری گۆڕان لە(Y) دیار دەکات ئەگەر بێتو گۆڕان بە یەك یەکە لە(X) ڕوویدات، بەهاکەشی نیشانەی موجەب یان سالیب دەبێت ئەویش بەپێ ی بەهای جیاکاری هاویەش (بەهای سەرەوە)، ئەگەر بێتو موجەب بوو، مانای بوونی پەیوەندی ڕاستەوانە لەنێوان ئەو دوو گۆڕاوە دەداتە دەستەوە، بەڵام ئەگەر بێتو بەهاکەی سالیب بوو، مانای بوونی پەیوەندی پێچەوانەیی لەنێوان دوو گۆڕاو دەگەیەنێت، کەچی ئەگەر بێتو بەهاکەی یەکسان بێت بەسفر مانای وایە پەیوەندی لەنێوان ئەو دوو گۆڕاوەدا نییە، ئەم شێوەی خوارەوە پەیوەندی هێڵی و شێوەی بلاوبوونەوە لەنێوان داهاتی مانگانەی خێزان و خەرجی مانگانەی خێزان بۆ بژاردەیەکی ڕەمەکی بۆ(9) خێزان دەخاتە ڕوو، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

| | x | y |
|---|---|---|
| 1 | 600 | 400 |
| 2 | 900 | 550 |
| 3 | 550 | 380 |
| 4 | 180 | 120 |
| 5 | 420 | 350 |
| 6 | 380 | 300 |
| 7 | 90 | 70 |
| 8 | 800 | 600 |
| 9 | 480 | 450 |




**شێوەی( 7.1 ):شێوەی بڵاوبوونەوە و هێڵی لارییوونی پەیوەندی نێوان داهات و خەرجی مانگانە**

کەبەهای ($y_1$) بریتییە لەبینەری ڕاستەقینەی بژاردە، لەبەرامبەردا( $\hat{y}_i$ ) بریتییە لەبەهای مەزندەکراو بە بەکارهێنانی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە و جیاوازی نێوان هەردووکیان پێ ی دەوترێت باقی، ئەمەش بریتییە لە جیاوازی نێوان بەهای ڕاستەقینە ($y_i$) و بەهای مەزەندەکراو( $\hat{y}_i$ ) واتە :-

$$e_i = y_i - \hat{y}_i \qquad \cdots \quad (7.3)$$

ڕێگای چوار لای بچووک، کەلەمەزەندەکردنی نیشانەکانی لاریبوونی هێڵی سادە بەکارهێنراوە وادەکات سەرجەمی چوار لای باقیەکانی زۆر بچووک دەبێت. واتە $\sum_{i=1}^{n} e_i^2$ زۆر زۆر بچووک بێت.

**نموونە**( 1.7 ) :- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییە لە بڕی خواست ( $y_i$ ) لەکالآیەکی دیاریکراو لەگەڵ نرخی یەك یەکە( $x_i$ ). داواکاری شێوەی بلاوبوونەوە بکێشە و مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە( $y/x$ ) بکە؟

| $y_i$ | 2 | 4 | 7 | 5 | 12 | 15 | 13 | 14 | 11 | 8 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $x_i$ | 10 | 8 | 6 | 7 | 5 | 4 | 5 | 6 | 5 | 7 |

**شیکار** :- بۆ کێشانی شێوەی بلاوبوونەوەی داتاکان پێویستە جووتەی بەهاکانی ($y_i$ و $x_i$) دیاری بکەین لەم شێوەیە(2.10)،(4.8) ...هتد(8.7) تەوەرەی ئاسۆیی بریتییە لە($x_i$)، لەبەرامبەردا تەوەرەی ستوونی بریتییە لە ($y_i$)، بەمەش ئەم شێوەی خوارەوەمان دێتە دەست :-




**شێوەی( 7.2 ):شێوەی بلاوبوونەوە و هێڵی لاریبوونی پەیوەندی نێوان داهات و خەرجی مانگانە**

لەمیانەی ئەم شێوەی سەرەوە، سەرنجی ئەوە دەدرێت، کەپەیوەندی پێچەوانەیی هێڵی لەنێوان بڕی خواست و نرخەکەی هەیە، بۆ مەزەندەکردنی مۆدێلی هێڵی یەکەمجار دەبێ هەژماری نێوەنجی هەردوو گۆڕاو بکەین، ئەویش بەم شێبوەی خوارەوە:-

$$\bar{y} = \frac{\sum_{i=1}^{n} y_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{10} y_i}{10} = \frac{91}{10} = 9.1$$

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{10} x_i}{10} = \frac{63}{10} = 6.3$$

بۆهەژمارکردنی نیشانەکانی مۆدێلەکە، پێویستە ئەم خشتەیە دروست بکەین:-

| $(x_i-\bar{x})^2$ | $(y_i-\bar{y})(x_i-\bar{x})$ | $x_i-\bar{x}$ | $y_i-\bar{y}$ | $x_i$ | $y_i$ | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 13.69 | 26.27- | 3.7 | 7.1- | 10 | 2 | 1 |
| 2.89 | 8.67- | 1.7 | 5.1- | 8 | 4 | 2 |
| 0.09 | 0.63 | 0.3- | 2.1- | 6 | 7 | 3 |
| 0.49 | 2.87- | 0.7 | 4.1- | 7 | 5 | 4 |
| 1.69 | 3.77- | 1.3- | 2.9 | 5 | 12 | 5 |
| 5.29 | 13.57- | 2.3- | 5.9 | 4 | 15 | 6 |
| 1.69 | 5.07- | 1.3- | 3.9 | 5 | 13 | 7 |
| 0.09 | 1.47- | 0.3- | 4.9 | 6 | 14 | 8 |
| 1.69 | 2.47- | 1.3- | 1.9 | 5 | 11 | 9 |
| 0.49 | 0.77- | 0.7 | 1.1- | 7 | 8 | 10 |
| 28.10 | 64.3 - | 0 | 0 | | | سەرجەم |

$$\hat{\beta}_1 = \frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2} = \frac{-64.3}{28.10} = -2.2883$$

$$\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1\bar{x} = 9.1 - (-2.2883)(6.3) = 23.5163$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، ئەو مۆدێلە مەزەندەکراوە بەم شێوەی خوارەوە:-

$$\hat{y}_i = 23.5163 - 2.2883x_i$$

لەمیانـەی ئـەم مـۆدێلی سـەرەوە بەتایبـەتی بـەهای($\hat{\beta}_1$=2.2883) سـەرنجی ئـەوە دەدرێت بەهاکەی سالیبە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە پەیوەندی پێچەوانەیی لـەنێوان بـڕی خواست لەکالاً لەگەڵ نرخەکەی هەیە، واتە زیادبوونی نرخی ئەو کالآیە بەبڕی یـەك دانـە، ئەوا دەبێتە هۆی دابەزینی بڕی خواست بـەبڕی (2.2883)، یـەکێك لەبەکارهێنانـەکانی مۆدێلی مەزەندەکراو بریتییە لەپێشبینی کردن بەبەهای (Y) کاتێك(X) خاوەن بەهایـەکی دیاریکراوە، ئەگەر گریمان بـەهای نرخـی کالآکـە ($X_0$=3) ، ئـەوا لەمیانـەی ئـەم مۆدێڵـە مەزەنـدەکراوە مەزەنـدەی بـڕی خواسـت لـەو کالآیـە بکـەین، ئـەویش بـەم شـێوەی خوارەوە:-

$$\hat{y}_i = 23.5163 - 2.2883x_i$$
$$\Rightarrow \quad \hat{y}_0 = 23.5163 - 2.2883x_0$$
$$= 23.5163 - 2.2883(3) = 16.6514$$

ئەمەش مانای ئەوەیە ئەگەر بێتو نرخی کالآکە (3) بێت، ئەوا بـڕی خواسـت لەسـەر ئـەو کالآیە(16.6514) دەبێت، هەروەها دەتوانرێت شێوەی بلاًوبوونەوە بکێشـرێت، لەگـەڵ هێڵی لاریبوونی مۆدێڵە مەزەندەکراوەکە، کە پەیوەندی نێوان بڕی خواست و نرخی یـەك یەکە بەم شێوەی خوارەوە ڕوون دەکاتەوە:-



**شێوەی( 7.3 ):بڵاوبوونەوە و هێڵی لاریبوون لە نێوان بڕی خواست و نرخەکەی**

**تێبینی :-** پەیوەندی نێوان هاوکۆلکەی لاریبوون( $\hat{\beta}_1$ ) و هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی سادە هەیە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوەیە:-

$$\hat{\beta}_1 = \frac{S_y}{S_x} \cdot r_{xy} \qquad \cdots \quad (7.4)$$

ئەمەش مانای ئەوەیە کە :-

$$r_{xy} = \frac{S_x}{S_y} \cdot \hat{\beta}_1 \qquad \cdots \quad (7.5)$$

**نموونە( 2.7 ):** لەبژاردەیەك کە لە(12) کرێکار پێك هاتووە پێوانەی کاربەجێهێنانیان کراوە ($y_i$)، و ($x_i$) بریتییە لەژمارەی ساڵەکانی شارەزایی لەکارەکانیاندا، ئەویش بەم شێوەی خوارەوەیە:-

| | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێکڕای کاربەجێهێنان $y_i$ | 85 | 74 | 76 | 90 | 85 | 87 | 94 | 98 | 81 | 91 | 76 | 74 |
| ساڵەکانی شارەزایی $x_i$ | 1 | 7 | 5 | 2 | 6 | 3 | 2 | 5 | 4 | 3 | 1 | 4 |

**داواکاری بریتییە لە :-**

1- شێوەی بڵاوبوونەوە لەنێوان تێکڕای کار بەجێهێنان و ساڵەکانی شارەزایی بکێشە .

2- مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە(y/x) بکە.

3- بەشێوەی ژمارەیی بسەلمێنە کە سەرجەمی باقیەکان یەکسانە بەسفر .

4- هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەهاوکۆلکەی لاریبوون بدۆزەرەوە.

**<u>شیکار</u> :-**

1- شێوەی بڵاوبوونەوە لەنێوان تێکڕای کار بەجێهێنان کە بریتییە لەتەوەرەی ستوونی و ساڵەکانی شارەزایشی بریتییە لەتەوەرەی ئاسۆیی ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-




**شێوەی( 7.3 ):بڵاوبوونەوە لە نێوان تێکرای کاربەجێهێنان و ساڵەکانی شارەزایی**

لەمیانەی ئەم شێوە بڵاوبوونەوەیەدا سەرنجی ئەوە دەدرێت، کەپەیوەندی هێڵی لەنێوان تێکرای کار بەجێهێنان و ساڵانی شارەزایی بەپشت بەستن بەو بژاردەیە نییە، ئەویش لەبەرئەوەی دابەش بوونی خاڵەکان بەشێوەی ڕەمەکی یە، نەك هێڵی بێت بەئاڕاستەیەکی دیاریکراوەوە.

2-بۆ مەزەندەکردنی مۆدێلی هێڵی لەنێوان تێکرای کار بەجێهێنان و ساڵەکانی شارەزایی، یەکەمجار نێوەنجی هەژمارکردنیان دەردەهێنین:-

$$\bar{y} = \frac{\sum_{i=1}^{n} y_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{12} y_i}{12} = \frac{1011}{12} = 84.25$$

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{12} x_i}{12} = \frac{43}{12} = 3.5833$$

ئینجا ئەم خشتەی خوارەوە دروست دەکەین :-

| $y_i^2$ | $x_i^2$ | $x_i y_i$ | $x_i$ | $y_i$ | زنجیرەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| 7225 | 1 | 85 | 1 | 85 | 1 |
| 5476 | 49 | 518 | 7 | 74 | 2 |
| 5776 | 25 | 380 | 5 | 76 | 3 |
| 8100 | 4 | 180 | 2 | 90 | 4 |
| 7225 | 36 | 510 | 6 | 85 | 5 |
| 7569 | 9 | 261 | 3 | 87 | 6 |
| 8836 | 4 | 188 | 2 | 94 | 7 |
| 9604 | 25 | 490 | 5 | 98 | 8 |
| 6561 | 16 | 324 | 4 | 81 | 9 |
| 8281 | 9 | 273 | 3 | 91 | 10 |
| 5776 | 1 | 76 | 1 | 76 | 11 |
| 5476 | 16 | 296 | 4 | 74 | 12 |
| **85905** | **195** | **3581** | **43** | **1011** | **سەرجەم** |

$$\hat{\beta}_1 = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i y_i - n\bar{x}\cdot\bar{y}}{\sum_{i=1}^{n} x_i^2 - n\bar{x}^2} = \frac{3581-(12)(3.5833)(84.25)}{195-(12)(3.5833)^2} = \frac{-41.7163}{40.9195} = -1.0195$$

$$\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1\bar{x} = 84.25 - (-1.0195)(3.5833) = 87.9032$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەمۆدێلی لاریبوونی مەزەندەکراو بەم شێوەیە دەبێت :-

$$\hat{y}_i = 87.9032 - 1.0195x_i$$

3)- بەشێوەی ژمارەیی بسەلمێنە، کەسەرجەمی باقییەکان یەکسانە بەسفر.

بۆ هەژمارکردنی باقییەکان پێویستە یەکەمجار بەهای( $\hat{y}_i$ ) ی مەزەندەکراو لەمۆدێلی سەرەوە بدۆزینەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$\hat{y}_i = 87.9032 - 1.0195x_i$$
$$\hat{y}_1 = 87.9032 - 1.0195x_1 = 87.9032 - 1.0195(1) = 86.8837$$
$$\hat{y}_2 = 87.9032 - 1.0195x_2 = 87.9032 - 1.0195(7) = 80.7667$$
$$\vdots$$
$$\hat{y}_{12} = 87.9032 - 1.0195x_{12} = 87.9032 - 1.0195(4) = 83.8252$$

بۆ هەژماركردنی بەهای باقییەكان دەقی(7.3) بەكاردەهێنین:-

$$e_i = y_i - \hat{y}_i$$
$$e_1 = y_1 - \hat{y}_1 = 85 - 86.8837 = -1.8837$$
$$e_2 = y_2 - \hat{y}_2 = 74 - 80.7667 = -6.7667$$
$$\vdots$$
$$e_{12} = y_{12} - \hat{y}_{12} = 74 - 83.8285 = -9.8285$$

لەسەر ئەم بنچینەیەدا، ئەوا سەرجەمی باقییەكان یەكسان دەبێت بەسفر، واتە:-

$$\sum_{i=1}^{n} e_i = \sum_{i=1}^{12} e_i = e_1 + e_2 + \cdots + e_{12}$$
$$= -1.8837 - 6.7667 + \cdots - 9.8285 = 0$$

4)- بۆ هەژماركردنی هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی هێڵی سادە لەهاوكۆلكەی لاریبووندا، دەقی(7.5) بەكار دەهێنین، كەپێویستی بەهەژماركردنی لادانی پێوەركاری بۆ هەردوو گۆڕاو هەیە، ئەویش بەم شێوەیە :-

$$S_y = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} y_i^2 - n\bar{y}^2}{n-1}} = \sqrt{\frac{85905 - (12)(84.25)^2}{12-1}} = \sqrt{\frac{728.25}{11}} = 8.1366$$

$$S_x = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} x_i^2 - n\bar{x}^2}{n-1}} = \sqrt{\frac{195-(12)(3.5833)^2}{12-1}} = \sqrt{\frac{40.9195}{11}} = 1.9287$$

بۆیە هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:-

$$r_{xy} = \frac{S_x}{S_y} \cdot \hat{\beta}_1 = \frac{1.9287}{8.1366} \cdot (-1.0195) = -0.2417$$

ئەمەش مانای ئەوەیە بەپێی ئەو بژاردەیە ئەوا پێکەوەلکانی هێڵی پێچەوانەیی لاواز هەیە کە یەکسانە بە(24.17-٪) لەنێوان تێکڕای کاربەجێهێنان و ژمارەی ساڵەکانی شارەزایی، بەڵام هەروەکو لەمەوپێش ئاماژەمان پێکرد پەیوەندی هێڵی لەنێوان هەردوو گۆڕاوی ئەو بژاردەیە نییە(واتە مەعنەوەی نییە)، یان ڕەنگە پەیوەندی ناهێڵی هەبێت، یاخود هۆکاری دیکە هەیە کاریگەری لەسەر تێکڕای کاربەجێهێنان هەیە.

## 1.3.7 :- هاوکۆلکەی دیاریکردن Coefficient of Determination :-

بریتییە لەپێوانەیەک، کەگوزارشت لەو بڕە دەکات، گۆڕاوی سەربەخۆ لەگۆڕانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ دەیکات، و هێمای($R^2$) بۆ دادەنرێت، دەتوانرێت لەمیانەی دووجاکردنەوەی هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەدەست بهێنرێت ، واتە:-

$$R^2 = (r_{xy})^2 \qquad \cdots \quad (7.6)$$

یان دەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە هەژمار بکرێت:-

$$R^2 = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{\sum_{i=1}^{n} (y_i - \bar{y})^2} \qquad \cdots \quad (7.7)$$

یاخود دەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقەی خوارەوە هەژمار بکرێت:-

$$R^2 = \frac{\sum_{i=1}^{n}(\hat{y}_i - \bar{y})^2}{\sum_{i=1}^{n}(y_i - \bar{y})^2} \quad \cdots \quad (7.8)$$

بۆزانینش :-

$$\sum_{i=1}^{n} y_i = \sum_{i=1}^{n} \hat{y}_i \qquad and \qquad \bar{y} = \bar{\hat{y}}$$

دیاره بەهای هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەهاکەی دەکەوێتە نێوان(1،1-) بۆیە بەهای هاوکۆلکەی دیاریکردن دەکەوێتە نێوان(1،0). ($R^2$) بریتییە لەو بڕەی کە گۆڕاوی سەربەخۆ لە گۆڕانەکانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ ڕاڤە دەکات(X). بۆیە($1- R^2$) بریتییە لەو پێوانەی کە گوزارشت لەبڕی ڕاڤەی کۆمەڵێك گۆڕاوی دیکە دەکات، کە لێکۆڵینەوەیان لەگۆڕانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ لێ ناکرێت واتە ناگەڕێتەوە بۆ($R^2$)، ئەمەش مانای ئەوەیە هەرکاتێك بەهای($R^2$) بەرزبوو، مانای ئەوە دەداتە دەستەوە، کە(X) کارێگاریی گەورەی لەسەر(Y) هەیە، پێچەوانەکەشی ڕاستەکەیەتی، هەروەها ئەگەر بێتو بەهای($R^2$) یەکسان بێت بەیەك، ئەوا مانای ئەوەیە، کە(X) تاکە گۆڕاوە ڕاڤەی گۆڕاوی ناسەربەخۆ(Y) دەکات بەهەمان شێوە ئەگەر بێتو($R^2$) یەکسان بێت بەسفر، مانای ئەوەیە ئەو گۆڕانانەی کە لە(Y) ڕوو دەدات، هۆکارەکەی گۆڕاوی سەربەخۆی دیکەیەو (X) هیچ کارێگاریی لەسەر گۆڕاوی ناسەربەخۆ(Y) نییە.

**نموونە**( 3.7 ) :- ئەگەر ئەم زانیارییانەی خوارەوەت هەبێت:-

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| $n = 20$ | $\sum_{i=1}^{n} y_i = 80$ | $\sum_{i=1}^{n} x_i = 50$ | $S_y^2 = 200$ | $S_x^2 = 100$ | $S_{xy} = 40$ |

**داواکاری بریتییە لە:-**

1) مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە بکە.

2) هەژماری هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادەبکە.

3) هەژماری هاوکۆلکەی دیاریکردن بکەو ڕاڤەی ماناکەشی بکە .

4) بەهای(Y) چەندە ئەگەر بێتو بەهای(X) یەکسان بێت بە(10).

**شیکار**:-

1) دەتوانرێت مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی سادە بکرێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$\bar{y}=\frac{\sum_{i=1}^{n}y_i}{n}=\frac{\sum_{i=1}^{20}y_i}{20}=\frac{80}{20}=4$$

$$\bar{x}=\frac{\sum_{i=1}^{n}x_i}{n}=\frac{\sum_{i=1}^{20}x_i}{20}=\frac{50}{20}=2.5$$

$$\hat{\beta}_1=\frac{S_{xy}}{S_x^2}=\frac{40}{100}=0.4$$

$$\hat{\beta}_0=\bar{y}-\hat{\beta}_1\bar{x}=4-(0.4)(2.5)=3$$

بۆیە مۆدێلی لاریبوونی مەزەندەکراو بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :-

لەمیانەی ئەم مۆدێلەی سەرەوە سەرنجی ئەوە دەدرێت، کەبەهای هاوکۆلکەی لاریبوون موجەبە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە پەیوەندیەکی راستەوانە لەنێوان گۆڕاوی سەربەخۆ(X) و گۆڕاوی ناسەربەخۆ(Y) هەیە.

2)- دەتوانرێت هەژماری هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەم شێوەی خوارەوە هەژماربکرێت :-

$$r_{xy}=\frac{S_x}{S_y}\cdot\hat{\beta}_1=\sqrt{\frac{S_x^2}{S_y^2}}\cdot\hat{\beta}_1=\sqrt{\frac{100}{200}}\cdot(0.4)=0.2828$$

یان هەژمارکردنی هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە بەرێگایەکی دیکە دەبێت:-

$$r_{xy}=\frac{S_{xy}}{S_x\cdot S_y}=\frac{40}{\sqrt{100}\cdot\sqrt{200}}$$

$$=\frac{40}{(10)\cdot(14.1421)}=\frac{40}{141.421}=0.2828$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپەیوەندیەکی راستەوانەی لاواز لەنێوان هەردوو گۆڕاو هەیەو یەکسانە بە(28.28٪)

3- هەژمارکردنی هاوکۆلکەی دیاریکردن بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:-

$$R^2 = (r_{xy})^2 = (0.2828)^2 = 0.08$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە گۆڕاوی سەربەخۆ(X)، تەنیا(8٪)گۆڕانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ(Y) راڤە دەکات و رێژەکەی دیکە، کە دەکاتە(92٪) هۆکارەکەی بۆ گۆڕاوەکانی دیکە دەگەڕێتەوە، کەلێکۆڵینەوەی لەبارەوە نەکراوە، ئەمەش دووپاتی لاوازی پەیوەندی نێوان هەردوو گۆڕاو دەکاتەوە.

4)- بەهای(Y) چاوەروانکراو، کاتێك بەهای(X) یەکسان بێت بە(10) لەمیانەی ئەم مۆدێلە مەزەندەکراوە بەدەستی دەهێنین :-

$$\hat{y}_i = 3 + 0.4x_i$$

$$\hat{y}_0 = 3 + 0.4x_0$$

$$= 3 + 0.4(10) = 7$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەبەهای(Y) چاوەڕوانکراو یەکسانە بە(7) کاتێك بەهای(X) یەکسان دەبێت بەسفر.

## 2.3.7 :- هەڵەی پێوەرکاری :-Standard Error

پێوەرێکی زۆر گرنگە پێوانەی توانستی مۆدێلی لاریبوونی مەزەندەکراو دەکات، واتە بڕی ووردەکاری مۆدێلی مەزەندەکراو لەپەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو دەکات، ئەویش لەڕوانگەی داتاکانی بەردەستەوە، هەرکاتێك بەهای هەڵەی پێوەرکاری بچووك بوو، بەڵگەیە لەسەر توانستی مۆدێلی مەزەندەکراو، پێچەوانەکەی راستەکەیەتی، سوودیش لەوپێوە ئەوەیە لەکاتی بەراورد لەنێوان دوو مۆدێل یان زیاتر لەبارەی هەمان دوو دیاردە دەبێت، ئەویش لەدوو لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ یان زیاتر، دەتوانرێت بەپێ ی ئەم یاسایەی خوارەوە هەژمار بکرێت :-

$$S_{y/x} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{n-2}} \qquad \cdots \quad (7.9)$$

**نموونه**( 4.7 ) :- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییـە لـەبڕی خسـتنەڕوو( $y_i$ ) لەکالآیـەکی دیاریکراو نرخی یەك دانە لەوکالآیە( $x_i$ ):

| بڕی خستنەڕوو $y_i$ | 6 | 8 | 4 | 10 | 13 | 5 | 3 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نرخی کالآ $x_i$ | 3 | 4 | 2 | 6 | 7 | 4 | 2 |

**داواکاری بریتییە لە** :-

1) مەزەنـــدەی مـــۆدێلی هێڵـــی لـــەنێوان بـــڕی خستنەڕوو(ناســـەربەخۆ) و نرخەکەی(سەربەخۆ).

2) مەزەنـــــدەی هاوکۆلکـــــەی دیـــــاریکردن و راڤـــــەش بکـــــە؟

3) مەزەنـدەی توانسـتی مۆدێلەکـە بکـە، ئـەویش لەمیانـەی هـەژمارکردنی هەڵـەی پێوەرکاری دا.

**شیکار:**

1)- بۆ مەزەندەکردنی مۆدێلی هەڵەی سادە ئەم خشتەی خوارەوە دروست دەکەین:-

| زنجیرە | $y_i$ | $x_i$ | $x_i y_i$ | $x_i^2$ | $y_i^2$ | $\hat{y}_i$ | $(y_i - \hat{y}_i)$ | $(y_i - \hat{y}_i)^2$ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 6 | 3 | 18 | 9 | 36 | 5.23 | 0.7727 | 0.6 |
| 2 | 8 | 4 | 32 | 16 | 64 | 7.00 | 1 | 1 |
| 3 | 4 | 2 | 8 | 4 | 16 | 3.45 | 0.5455 | 0.3 |
| 4 | 10 | 6 | 60 | 36 | 100 | 10.55 | -0.5455 | 0.3 |
| 5 | 13 | 7 | 91 | 49 | 169 | 12.32 | 0.6818 | 0.46 |
| 6 | 5 | 4 | 20 | 16 | 25 | 7.00 | -2 | 4 |
| 7 | 3 | 2 | 6 | 4 | 9 | 3.45 | 0.4546- | 0.21 |
| سەرجەم | 49 | 28 | 235 | 134 | 419 | 49 | 0 | 6.86 |

$$\bar{y} = \frac{\sum_{i=1}^{n} y_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{7} y_i}{7} = \frac{49}{7} = 7$$

$$\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{7} x_i}{7} = \frac{28}{7} = 4$$

$$\hat{\beta}_1 = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i y_i - n\,\bar{x}\cdot\bar{y}}{\sum_{i=1}^{n} x_i^2 - n\,\bar{x}^2} = \frac{235-(7)(4)(7)}{134-(7)(4)^2} = \frac{39}{22} = 1.7727$$

$$\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1\bar{x} = 7-(1.7727)(4) = -0.0908$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەمۆدێلی لاریبوونی هێڵی مەزەندەکراو بریتییە لە:-

$$\hat{y}_i = -0.0908 + 1.7727x_i$$

2) دەتوانرێت مەزەندەی هاوکۆلکەی دیاریکردن بەم شێوەی خوارەوە بکرێت:-

یەکەمجار هەژماری بەهای( $\hat{y}_i$ ) لەمیانەی مۆدێلی مەزەندەکراو دەکرێت، دووای ئەوە هەژماری باقییەکان لەمیانەی کەمکردنی لەبەهای($y_i$) دەکرێت، ئینجا دووجای دەکەینەوەو کۆشی دەکەینەوە، هەروەکو لەخشتەی سەرەوە دەبینرێت لەسەر ئەو بنچینەیەدا دەقی(7.7)ی لەسەر جێ بە جێ دەکەین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە :-

$$R^2 = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2} = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n}(y_i-\hat{y}_i)^2}{\sum_{i=1}^{n} y_i^2 - n\,\bar{y}^2}$$

$$= 1 - \frac{6.86}{419-(7)(7)^2} = 1 - \frac{6.86}{76} = 1 - 0.0903 = 0.9097$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە(90.97٪) لەگۆڕانکارییەکان لەبڕی خستنەڕوو هۆیەکەی بۆ نرخ دەگەڕێتەوەو ڕێژەی (9.03٪) ی گۆڕانکارییەکان بۆ گۆڕاوی دیکە دەگەڕێتەوە، کەلێکۆڵینەوەی لەبارەیەوە نەکراوە.

3- مەزەندەی توانستی مۆدێلەکە بکە، ئەویش لەمیانەی هەڵەی پێوەرکاری بەم شێوەی خوارەوە:-

$$S_{y/x}=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}e_i^2}{n-2}}=\sqrt{\frac{6.86}{7-2}}=\sqrt{1.372}=1.1713$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەهەڵەی پێوەرکاری، کەتوانستی مۆدێلەکە پێوانە دەکات بریتییە لە(1.1713)

**نموونە(** 5.7 **):** ئەگەر ئەم زانیاریانەی خوارەوەت هەبێت:-

| | | |
|---|---|---|
| $n=15$ | $S_y^2=50$ | $R^2=0.75$ |

هەڵەی پێوەرکاری بدۆزەرەوە ؟

**شیكار:**- لەجیاکاری گۆڕاوی ناسەربەخۆ دەتوانرێت سەرجەمی چوارگۆشەی لادانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ لەنێوەنجی هەژمارکردن بدۆزرێتەوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-

$$S_y^2=\frac{\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}{n-1}\Rightarrow 50=\frac{\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}{15-1}\Rightarrow\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2=(50)\cdot(14)=700$$

$$R^2=1-\frac{\sum_{i=1}^{n}e_i^2}{\sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}\Rightarrow 0.75=1-\frac{\sum_{i=1}^{n}e_i^2}{700}$$

$$\Rightarrow 1-0.75=\frac{\sum_{i=1}^{n}e_i^2}{700}\Rightarrow(0.25)\cdot(700)=\sum_{i=1}^{n}e_i^2$$

$$\therefore\quad\sum_{i=1}^{n}e_i^2=175$$

ئەوا هەڵەی پێوەرکاری بریتییەلە:-

$$S_{y/x}=\sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n}e_i^2}{n-2}}=\sqrt{\frac{175}{15-2}}=\sqrt{13.4615}=3.669$$

## 4.7 :- **لاریبـــوونی هێڵـــی فرەیـــی** :- Multiple Linear Regression

لاریبـوونی هێڵـی فرەیـی لـەکردەی مەزەنـدەی پـەیوەنی هێڵـی لـەنێوان گـۆڕاوی ناسەربەخۆو گۆڕاوە سەربەخۆکان(زیاتر لەگۆڕاوێکی سەربەخۆ) بەکار دەهێنرێت، ڕەنگـە بەکۆمەڵ کارێگارییان لەسەر گۆڕاوی ناسەربەخۆ هـەبێت، لێرەدا جـەخت لەسـەر بـوونی دوو گـۆڕاوی سـەربەخۆ دەکەینـەوە، بـەلاَم لەمـە زیـاتر ئـەوا دەکەوێتـە دەرەوەی چوارچێوەی ئـەم کتێبـە، بۆیـە مـۆدێلی فرەیـی دوو گـۆڕاوی سـەربەخۆ بریتییـە لەمـەی خوارەوە:-

$$y_i = \beta_0 + \beta_1 x_{i1} + \beta_2 x_{i2} + \varepsilon_i \qquad \cdots \quad (7.10)$$

($y_i$) بریتییە لەژمارەی بینەرانی گـۆڕاوی ناسـەربەخۆ (وەك خـەرجی مانگانـەی خێزانـە، لەهەمان کاتدا($x_{i1}$) بریتییە لەبینەرانی گۆڕاوی سەربەخۆی یەکەم(وەك داهاتی مانگانـەی خێزان) هەروەها($x_{i2}$) بریتییە لە بینەرانی گۆڕاوی سەربەخۆی دووەم (ژمارەی ئەندامانی خێـزان)، لەهـەمان کاتـدا ( $\varepsilon_i$ ) بریتییـە لەهەڵـەی ڕەمەکی(پێویسـتە لەمۆدێڵـدا بـوونی هەبێت، چونکە پەیوەندی تـەواوی دیاریکراومـان لـەنێوان گـۆڕاوی ناسـەربەخۆو هـەردوو گۆڕاوی سەربەخۆ نییە)، کەبریتییە لەگۆڕانی گۆڕاوی ناسـەربەخۆ لەئـەنجامی کارێگـاریی ژمارەیەك گۆڕاوی دیکە(بێجگە لەو دوو گۆڕاوە) کەلێکۆڵینـەوەیان لەبارەیـەوە نـەکراوە. ($B_0$) و ($B_1$) و ($B_2$) بریتییە لەنیشـانەکانی مـۆدێلی لاریبـوونی هێڵـی فرەیـی کۆمـەڵگا، یـەکێك لەڕێگاکانیشـی بۆمەزەنـدەی نیشـانەکانی هێڵـی لاریبـوونی فرەیـی بژاردەکـە بـەکاردەهێنرێت وەك ڕێگـای چوارگۆشـە بچووکە ئاسـاییەکان(OLS)، واتـە مەزەنـدەی نیشانەکانی مۆدێڵەکە بەم شێوەی خوارەوە:-

$$\hat{y}_i = \hat{\beta}_0 + \hat{\beta}_1 x_{i1} + \hat{\beta}_2 x_{i2} \qquad \cdots \quad (7.11)$$

( $\hat{y}_i$ )، بریتییەلەبـەهای مەزەنـدەکراوی گـۆڕاوی ناسـەربەخۆ لەمیانـەی مـۆدێلی مەزەنـدەکراوی سـەرەوە($B_0$) و ($B_1$) و ($B_2$)، بریتییەلـە نیشـانەکانی مـۆدێلی مەزەندەکراوی بژاردە، کەدەتوانرێت لەمیانەی ئەم دەقانەی خوارەوە هەژماربکرێت:-

$$\hat{\beta}_1 = \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)^2} \quad \cdots \quad (7.12)$$

$$\hat{\beta}_2 = \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)^2} \quad \cdots \quad (7.13)$$

$$\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1 \bar{x}_1 - \hat{\beta}_2 \bar{x}_2 \quad \cdots \quad (7.14)$$

کەبەهای ( $y_i$ و $X_{i1}$ و $X_{i2}$) بریتییە لە لادانی بەهاکانی لەنێوەنجی هەژمارکردن، واتە:—

$$Y_i = y_i - \bar{y}, \quad X_{i1} = x_{i1} - \bar{x}_1, \quad X_{i2} = x_{i2} - \bar{x}_2$$

ئـەم شـێوە بڵاوبوونەوەیـە سـێ لاییـە، کـەتێبینی دەکرێت لەمیانـەی ئـەم داتایانـەی خوارەوە، کەبریتییەلە(30) بینەر بۆ گۆراوی سەربەخۆو هەردوو گۆراوی سەربەخۆ :—




**شـێوەی( 7.5 ):بڵاوبوونـەوە لـە نێـوان گـۆڕاوی ناسـەربەخۆ لـە بەرامبـەر دوو گـۆڕاوی سەربەخۆ**

مۆدێلی لاریبوونی فرەیی خاوەن دوو گۆڕاوی سەربەخۆ بریتییـە لـە باشـترین ئاسـتی لاریبوون لەکەشی سێ لایی، ($X_2$ و $X_1$ و $y$) ، کەگوزارشـت لەپەیوەنـدی نێـوان گـۆڕاوی ناسەربەخۆ لەلایەك و هەردوو گۆڕاوی سـەربەخۆ لەلایـەکی دیکـە دەکـات، بۆیـە شـێوەی

بلاوبوونەوەی(شێوەی 7.5) دەتوانرێت مەزەندی مۆدێلی فرەیی گونجاو بکرێت، دوای ئەوە شێوەی ئەم مۆدێلە دەکێشین ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:-




**شێوەی( 7.6 ):ئاستی لاریبوونی نێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆ لە بەرامبەر دوو گۆڕاوی سەربەخۆ**

( $\hat{\beta}_1$ ) بریتییە لەخاڵی یەکتربڕینی ئاستی لاریبوون لەتەوەرەی(Y)، هەروەها( $\hat{\beta}_1$ ) بریتییە لەهاوکۆلکەی لاریبوونی (Y) لەسەر($X_1$) بەسەلماندنی کارێگاریی($X_2$)، ( $\hat{\beta}_2$ ) بریتییە لەهاوکۆلکەی لاریبوون لەسەر ($X_2$) بەسەلماندنی کارێگاریی($X_1$)، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە( $\hat{\beta}_1$ ) بریتییە لەبڕی گۆڕانی (Y) بەیەك یەکە، کاتێك($X_1$) چەسپاو دەبێت،($X_2$) بریتییە لەبڕی گۆڕانی( $\hat{\beta}_2$ ) لەکاتی گۆڕانی ($X_2$) بەیەك یەکە، لەگەڵ چەسپاوی($X_1$). ئەگەر بێتو بەهاکەی هاوکۆلکەی لاریبوون موجەب بوو، بەڵگەیە لەسەر بوونی پەیوەندی راستەوانە لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆ لەگەڵ هەردوو گۆڕاوە سەربەخۆکان، بەلام ئەگەر بێتو سالیب بوون بەڵگەیە لەسەر بوونی پەیوەندی

پێچەوانەیی لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆو گۆڕاوەکانی سەربەخۆ، لەهەمان کاتدا ئەگەر بێتو یەکەم موجەب بێت و دووەمیش سالیب بێت، بەڵگەیە لەسەر بوونی پەیوەندی راستەوانە لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆو گۆڕاوی سەربەخۆی یەکەم، بەڵام پەیوەندی لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆو گۆڕاوی سەربەخۆی دووەم پەیوندیەکی پێچەوانەییە، لەکۆتاییدا ئەگەر بێتو بەهای هاوکۆلکەی لاریبوون یەکسان بوو بەسفر، واتە پەیوەندی لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆو گۆڕاوە سەربەخۆکان هەیە، ئەو گۆڕانکاریانەش کە لەگۆڕاوی نا سەربەخۆ رووددەدات، ئەو گۆڕاوە سەربەخۆیانە راڤەی ناکات، بەڵکو گۆڕاوی دیکە هەیە، کەلێکۆڵینەوەی لەبارەییەوە نەکراوە، هۆکارێکە بۆگۆڕانکاری لەگۆڕاوی ناسەربەخۆ.

**نموونە**( 6.7 ):- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییەلە ئەنجامی راپرسی (10) خێزان سەبارەت بەنێوەنجی خەرجی مانگانەییان لە جلوبەرگدا($y_i$) و خەرجی هەمووەکی($x_{i1}$)، نێوەنجی نرخی هەمووەکی جلوبەرگ($x_{i2}$)(بەهەزار دینار) :-

| نێوەنجی نرخی جلوبەرگ $x_{i2}$ | خەرجی هەمووەکی $x_{i1}$ | خەرجی بۆ جلوبەرگ $y_i$ |
|---|---|---|
| 15 | 105 | 20 |
| 12 | 110 | 35 |
| 25 | 90 | 18 |
| 16 | 108 | 24 |
| 10 | 150 | 36 |
| 4 | 200 | 50 |
| 4 | 160 | 45 |
| 30 | 90 | 12 |
| 22 | 100 | 15 |
| 14 | 100 | 20 |

**داواکاری بریتییە** :-

1) مەزەندەکردنی دالەی لاریبوونی فرەیی بۆخەرجی لەسەر جلوبەرگ دا، لەمیانەیدا راڤەی پەیوەندی نێوان پەیوەندی خەرجی لەسەر جلوبەرگ لەسەر خەرجی هەمووەکی و نێوەنجی نرخی جلوبەرگ بکە.

2) مەزەندەی بەهای خەرجی لەسەر جلوبەرگ بکە؟ کاتێك خەرجی هەمووەکی(250) هەزار دینار بێت و نێوەنجی نرخی جلوبەرگ(2) هەزار دینار بێت.

**شیکار :-**

1)- بۆمەزەندەی دالەی لاریبوونی فرەیی خەرجی لەسەر جلوبەرگ، پێویستە یەکەمجار هەژماری نێوەنجی هەژمارکردن بکەیت بۆ هەرسێ گۆڕاو دەربهێنین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:—

$$\bar{y} = \frac{\sum_{i=1}^{n} y_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{10} y_i}{10} = \frac{275}{10} = 27.5$$

$$\bar{x}_1 = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_{i1}}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{10} x_{i1}}{10} = \frac{1213}{10} = 121.3$$

$$\bar{x}_2 = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_{i2}}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{10} x_{i2}}{10} = \frac{152}{10} = 15.2$$

لەمیانەییدا هەژماری لادانەکانی بەهای لەنێوەنجی هەژمارکردن دەکەیت، واتە:—

$$Y_i = y_i - \bar{y}, \quad X_{i1} = x_{i1} - \bar{x}_1, \quad X_{i2} = x_{i2} - \bar{x}_2$$

دوای ئەوە لادانەکان لەگەڵ هەندێك کردەی جەبری پێویست کورت دەکەینەوە، ئەویش لەمیانەی ئەم خشتەیەی خوارەوە:—

| $X_{i2}Y$ | $X_{i1}Y_i$ | $X_{i2}^2$ | $X_{i1}^2$ | $X_{i1}X_{i2}$ | $X_{i2}$ | $X_{i1}$ | $Y_i$ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1.5 | 122.25 | 0.04 | 265.69 | 3.26 | 0.2- | 16.3- | 7.5- |
| 24- | 84.75- | 10.24 | 127.69 | 36.16 | 3.2- | 11.3- | 7.5 |
| 93.1- | 297.35 | 96.04 | 979.69 | 306.74- | 9.8 | 31.3- | 9.5- |
| 2.8- | 46.55 | 0.64 | 176.89 | 10.64- | 0.8 | 13.3- | 3.5- |
| 44.2- | 243.95 | 27.04 | 823.69 | 149.24- | 5.2- | 28.7 | 8.5 |
| 252- | 1770.75 | 125.44 | 6193.69 | 881.44- | 11.2- | 78.7 | 22.5 |
| 196- | 677.25 | 125.44 | 1497.69 | 433.44- | 11.2- | 38.7 | 17.5 |
| 229.4- | 485.15 | 219.04 | 979.69 | 463.24- | 14.8 | 31.3- | 15.5- |
| 85- | 266.25 | 46.24 | 453.69 | 144.84- | 6.8 | 21.3- | 12.5- |
| 9 | 159.75 | 1.44 | 453.69 | 25.56 | 1.2- | 21.3- | 7.5- |
| 916- | 3984.5 | 651.6 | 11952.1 | 2324.6- | 0 | 0 | 0 |

لەسەر ئەو بنچینەیەدا دەتوانرێت مەزەندەی نیشانەکانی لاریبوونی فرەیی بکرێت، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:—

$$\hat{\beta}_1=\frac{\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i2}^2\right)-\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i2}Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i2}^2\right)-\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}X_{i2}\right)^2}$$

$$=\frac{(3984.5)(651.6)-(-916)(-2324.6)}{(11952.1)(651.6)-(-2324.6)^2}=\frac{466966.6}{2384223.2}=0.1959$$

$$\hat{\beta}_2=\frac{\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i2}Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}^2\right)-\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i2}^2\right)-\left(\sum_{i=1}^{n}X_{i1}X_{i2}\right)^2}$$

$$=\frac{(-916)(11952.1)-(3984.5)(-2324.6)}{(11952.1)(651.6)-(-2324.6)^2}=\frac{-1685754.9}{2384223.2}=-0.707$$

$$\hat{\beta}_0=\bar{y}-\hat{\beta}_1\bar{x}_1-\hat{\beta}_2\bar{x}_2$$
$$=27.5-(0.1959)(121.3)-(-0.707)(15.2)=14.4837$$

بۆیە دالەی لاریبوونی فرەیی بۆ خەرجی لەسەر جلوبەرگ بریتییە لە:-

$$\hat{y}_i=14.4837+0.1959x_{i1}-0.707x_{i2}$$

لەمیانـەی دالـەی خـەرج کـردن لەسـەر جـل و بـەرگی مەزەنـدەکراو، سـەرنجی ئـەوەدەدەین، کەپەیوەندیـەکی راسـتەوانە لـەنێوان خـەرجی جلوبـەرگ و خـەرجی هەمووەکی هەیە، چونکە بەهای($\hat{\beta}_1$) موجەبە، لەهەمان کاتدا پەیوەندیەکی پێچـەوانەیی لەنێوان خەرجی لەسەر جلوبەرگ و نێوەنجی نرخەکەی هەیە، ئەویش لەبەرئـەوەی ($\hat{\beta}_2$) بەهاکەی سالیبە.

2) بۆ مەزەندەکردنی خەرجی بۆ جلوبەرگ ($\hat{y}_0$) کاتێك ($x_1=250$ و $x_2=2$) ئەمانـەی خوارەوەمان هەیە:-

$$\hat{y}_i=14.4837+0.1959x_{i1}-0.707x_{i2}$$
$$\hat{y}_0=14.4837+0.1959(250)-0.707(2)=62.045$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەبڕی خەرجی جل و بەرگ بریتییە لە (62.045) هەزار دینار، کاتێك خەرجی هەمووەکی بریتییە لە(250) هەزار دینار، نێوەنجی نرخی جل و بەرگ بریتییە لە(2) هەزار دینار.

**تێبینی** :- سەرجەمی باقییەکان بۆ لاریبوونی هێڵی فرەیی بەهەمان شێوە یەکسانە بەسفر.

## 1.4.7 :- هاوکۆلکەی دیاریکردن بۆ لارییوونی هێڵی فرەیی هاوکۆلکەی دیاریکردن بۆ لارییوونی هێڵی فرەیی :

بریتییە لەو بڕەی کە ڕاڤەی گۆڕانەکانی گۆڕاوی ناسەربەخۆ(Y) لەئەنجامی کاریگەریی ژمارەیەك گۆڕاوی سەربەخۆ دروست دەبێت(زیاتر لەگۆڕاوێکی سەربەخۆ)، یان پلەی پشکداری گۆڕاوە سەربەخۆکان لەگۆڕاوی(Y) دیاری دەکات، کەدەتوانرێت هەژمار بکرێت لەمیانەی دۆزینەوەی دووجای هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی فرەیی لەنێوان(Y) و گۆڕاوە سەربەخۆکان، ئەگەر بێتو دوو گۆڕاوی سەربەخۆمان هەبێت، ئەوا هاوکۆلکەی دیاریکردن بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :-

$$R^2_{y.x_1x_2} = \left(r_{y.x_1x_2}\right)^2 \qquad \cdots \quad (7.15)$$

یان دەتوانرێت بەپێ ی ئەم دەقەی خوارەوە هەژمار بکرێت:-

$$R^2_{y.x_1x_2} = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2} \qquad \cdots \quad (7.16)$$

یاخود دەتوانرێت بەپێ ی ئەم دەقەی خوارەوە هەژمار بکرێت :-

$$R^2_{y.x_1x_2} = \frac{\sum_{i=1}^{n} \left(\hat{y}_i - \bar{y}\right)^2}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2} \qquad \cdots \quad (7.17)$$

یان دەتوانرێت بەپێ ی ئەم دەقەی خوارەوە هەژمار بکرێت:-

$$R^2_{y.x_1x_2} = \frac{\hat{\beta}_1 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i + \hat{\beta}_2 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2} \quad \cdots \quad (7.18)$$

**نموونــه**( 7.7 ) :- هاوكۆلكــەی دیــاریكردن بــدۆزەرەوە لەنموونــەی (6.7) لەمیانەیــدا هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی فرەیی لەنێوان خەرجی جل و بەرگ لەگەڵ خەرجی هەمووەكی و نێوەنجی نرخی جل و بەرگ بدۆزەرەوە .

**شیكار :-**

یەكەمجار پێویستمان بەهەژماركردنی لادانی بـەهاكان لـەنێوەنجی هـەژماركردنی گـۆڕاوی (Y) دەكەین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:ـ

$$\sum_{i=1}^{n} Y_i^2 = (-7.5)^2 + (7.5)^2 + \cdots + (-7.5)^2 = 1552.5$$

هەر لەمیانەی زانیاری نموونـەی پێشـوو دەتـوانین دەقـی(7.18) ی لەسـەر جـێ بـەجێ بكەین، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە:ـ

$$R^2_{y.x_1x_2} = \frac{\hat{\beta}_1 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i + \hat{\beta}_2 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2}$$

$$= \frac{(0.1959)(3984.5) + (-0.707)(-916)}{1552.5} = \frac{1428.1756}{1552.5} = 0.92$$

ئەمـەش مانـای ئەوەیـە، كـە(92٪) ی ئـەو گۆڕانانـەی لەخـەرجی بـۆ جـل و بـەرگ ڕوودەدات راڤەكەی بۆ خەرجی هەمووەكی و نێوەنجی نرخی جـل و بـەرگ دەگەڕێتـەوە، لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی راستەوانە لەنێوان گـۆڕاوی ناسـەربەخۆو گـۆڕاوە سـەربەخۆكان بەشێوەیەكی گشتی هەیە(چونكە بەگوێرەی ئەم ڕێگایە ئاراسـتەی پەیوەندییـەكان ڕوون نییـە) بۆیـە هاوكۆلكـەی پێكـەوەلكانی فرەیـی لەمیانـەی وەرگرتنـی ڕەگـی دووجـا بـۆ هاوكۆلكەی دیاریكردن دەدۆزینەوە ئەویش بەم شێوەی حوارەوە :ـ

$$r_{y.x_1x_2} = \sqrt{R^2_{y.x_1x_2}} = \sqrt{0.92} = 0.9592$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپەیوەندیکی راستەوانەی بەهێز لەنێوان خەرجی جل و بەرگ لەگەڵ خەرجی هەمووەکی و نێوەنجی نرخی جل و بەرگ دا هەیە، کە یەکسانە بە(%95.92) .

## 2.4.7 :- هەڵەی پێوەرکاری بۆلارییوونی هێڵی فرەیی :-

بریتییە لەپێوانەی توانستی مۆدێڵی لاریبوونی هێڵی فرەیی، واتە بڕی ووردەکاری بریتییە لەمۆدێڵی مەزەندەکراو بۆ پەیوەندی نێوان گۆڕاوی نێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆ لەگەڵ گۆڕاوە سەربەخۆکاندا(لێرەشدا تەنیا ئاماژە بەدوو گۆڕاوی سەربەخۆ دەکەین) لەڕوانگەی داتاکانی بەردەست، هەر کاتێك بەهای هەڵەی پێوەرکاری بچووك بوو، بەڵگەیە لەسەر توانستی مۆدێڵی مەزەندەکراو، پێچەوانەکەش راستیەکەیەتی، ئەمەش زۆر جیاوازی لەگەڵ هەڵەی پێوەرکاری مەزەندەکراوی مۆدێڵی هێڵی سادە نییە، دەتوانرێت بەبەکارهێنانی ئەم یاسایەیی خوارەوە هەژمار بکرێت:-

$$S_{y/x_1x_2} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{n-3}} \qquad \cdots \quad (7.19)$$

**نموونە**( 8.7 ):- هەڵەی پێوەرکاری لەم زانیاریانەی بەردەست لەنموونەی(6.7) و نموونەی(7.7) بدۆزەرەوە:-

**شیکار** :- ئەم زانیاریانەی خوارەوەمان هەیە:-

$$: \quad n = 10 \qquad \sum_{i=1}^{n} Y_i^2 = 1552.5 \qquad R^2_{y.x_1x_2} = 0.92$$

$$R^2_{y.x_1x_2} = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2} \Rightarrow 0.92 = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{1552.5} \Rightarrow 0.08 = \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{1552.5}$$

$$\Rightarrow \sum_{i=1}^{n} e_i^2 = (0.08)(1552.5) = 124.2$$

لەسەر ئەم بنچینەیەدا دەتوانرێت هەڵەی پێوەرکاری بەم شێوەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت :-

$$S_{y/x_1x_2} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{n-3}} = \sqrt{\frac{124.2}{10-3}} = \sqrt{17.7429} = 4.2122$$

**تێبینی** :- لەبواری پراکتیکی دا، لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاوە، یەکێکیان ناسەربەخۆن و ئەوی تریان سەربەخۆیە لەراستیدا نا واقیعیە، ئەویش لەبەرژەوەندی یەك گۆڕاو نییە کاریگەربێت بەتەنیا لە یەك گۆڕاو دا، بەڵکو بەژمارەیەك کاریگەر دەبێت، ئینجا هەر کاتێك ژمارەی گۆڕاوە سەربەخۆکان زیادی کرد، ئەمەش مانای لاوازی هەڵەی ڕەمەکی دەگەیەنێت، ئەویش بەهۆی وەرگرتنی بەشی گەورە لەپێکهاتەکەی لەمۆدێلەکەدا، ئەم پرۆسەیە کاریگەریی بۆسەر مەزەندەی نیشانەکانی مۆدێلی مەزەندەکراو هەیە، بەهەمان شێوە کارێگاریی لەسەر پێوەرەکانی وەك هاوکۆلکەی دیاریکردن و هەڵەی پێوەرکاری هەیە.

نموونە(9.7) :- گریمان ئەم داتایانەی خوارەوەت هەیە:-

| | y | x1 | x2 |
|---|---|---|---|
| 1 | 2 | 3 | 1 |
| 2 | 5 | 4 | 0 |
| 3 | 4 | 5 | 1 |
| 4 | 0 | 3 | 0 |
| 5 | 6 | 7 | 0 |
| 6 | 1 | 2 | 4 |

**داواکاری :-**

خشتەی بەراوردکاری لەنێوان مۆدێلی لاریبوونی سادە بۆ گۆڕاوەکانی($y_i$) و ($x_i$) مۆدێلی لاریبوونی هێڵی فرەیی بۆ گۆڕاوەکانی($y_i$) و ($X_1$) و ($X_2$) بکە، ئەویش لەڕووی نیشانەی مەزەندەکراو و هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی دیاریکردن و هەڵەی پێوەرکاری .

**شیکار** :- یەکەمجار ژمارەی نێوەنجی هەژمارکردنی هەرسێ گۆڕاو بەم شێوەی خوارەوە دەکەین :-

$$\bar{y} = \frac{\sum_{i=1}^{n} y_i}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{6} y_i}{6} = \frac{18}{6} = 3$$

$$\bar{x}_1 = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_{i1}}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{6} x_{i1}}{6} = \frac{24}{6} = 4$$

$$\bar{x}_2 = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_{i2}}{n} = \frac{\sum_{i=1}^{6} x_{i2}}{6} = \frac{6}{6} = 1$$

کەلەمیانەیدا هەژماری لادانی بەهاکانی لەنێوەنجی هەژمارکردن دەکەین، واتە:-

$$Y_i = y_i - \bar{y}, \quad X_{i1} = x_{i1} - \bar{x}_1, \quad X_{i2} = x_{i2} - \bar{x}_2$$

ئینجا لادانەکان لەگەڵ هەندێك کردەی جەبری پێویست لەمیانەی ئەم خشتەیە کورت دەکەینەوە :-

| $X_{i2}Y$ | $X_{i1}Y_i$ | $X_{i1}X_{i2}$ | $X_{i2}^2$ | $X_{i1}^2$ | $Y_i^2$ | $X_{i2}$ | $X_{i1}$ | $Y_i$ | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 0 | 1 | 0 | 0 | 1 | 1 | 0 | 1- | 1- | 1 |
| 2- | 0 | 0 | 1 | 0 | 4 | 1- | 0 | 2 | 2 |
| 0 | 1 | 0 | 0 | 1 | 1 | 0 | 1 | 1 | 3 |
| 3 | 3 | 1 | 1 | 1 | 9 | 1- | 1- | 3- | 4 |
| 3- | 9 | 3- | 1 | 9 | 9 | 1- | 3 | 3 | 5 |
| 6- | 4 | 6- | 9 | 4 | 4 | 3 | 2- | 2- | 6 |
| 8- | 18 | 8- | 12 | 16 | 28 | 0 | 0 | 0 | سەرجەم |

لەسەر ئەو بنچینەیەدا دەتوانرێت مەزەندەی نیشانەی لاریبوونی هێڵی سادە بەم شێوەی خوارەوە بکرێت:-

$$\hat{\beta}_1 = \frac{\sum_{i=1}^{n} (x_{i1} - \bar{x}_1)(y_i - \bar{y})}{\sum_{i=1}^{n} (x_{i1} - \bar{x}_1)^2} = \frac{\sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i}{\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2} = \frac{18}{16} = 1.125$$

$$\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1 \bar{x}_1 = 3 - (1.125)(4) = -1.5$$

ئەمەش مانای ئەوەیە ئەومۆدێلە مەزەندەکراوە بریتییە لە:-

$$\hat{y}_i = -1.5 + 1.125 x_{i1}$$

ئەمەش مانای ئەوەیە پەیوەندیەکی راستەوانە لەنێوان($y$) و($X_1$) هەیە، چونکە هاوکۆلکەی لاریبوون بریتییە لەبەهای موجەب، واتە زیادبوونی($X_1$) بەبڕی یەك دانە، دەبێتە هۆکاری زیادبوونی($y$) بەبڕی(1.225). هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان($y$) و($X_1$) بەم شێوەی خوارەوەیە:-

$$r_{x_1 y} = \frac{\sum_{i=1}^{n}(x_{i1}-\bar{x}_1)(y_i-\bar{y})}{\sqrt{\sum_{i=1}^{n}(x_{i1}-\bar{x}_1)^2 . \sum_{i=1}^{n}(y_i-\bar{y})^2}} = \frac{\sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i}{\sqrt{\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2 \cdot \sum_{i=1}^{n} Y_i^2}}$$

$$= \frac{18}{\sqrt{(16)(28)}} = \frac{18}{21.166} = 0.85$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپەیوەندیکی راستەوانەی بەهێز لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆو گۆڕاوی سەربەخۆدا هەیە. هاوکۆلکەی دیاریکردنی مۆدێلی هێڵی سادەی مەزەندەکراو بریتییە لە:-

$$R^2 = \left(r_{x_1 y}\right)^2 = (0.85)^2 = 0.7225$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە(72.25٪)ی گۆڕانەکانی($y$)، هۆکارەکەی بۆ گۆڕاوی سەربەخۆ($X_1$) دەگەڕێتەوەو ڕێژەی(27.75٪)ی دەمێنێتەوە بۆ گۆڕاوی سەربەخۆی دیکە دەگەڕێتەوەو لێکۆڵینەوەی لەبارەیەوە نەکراوە، مەزەندەی هەڵەی پێوەرکاری بۆ مۆدێلی هێڵی سادەی مەزەندەکراو بریتییە لە:-

لەبەکارهێنانی مۆدێلی هێڵی سادە دەتوانرێت هەژماری بەهای مەزەندەکراوی گۆڕاوی ناسەربەخۆ( $\hat{y}_i$ ) بەم شێوەی خوارەوە بکرێت:-

$$\hat{y}_i = -1.5 + 1.125x_{i1}$$
$$\hat{y}_1 = -1.5 + 1.125x_{11} = -1.5 + 1.125(3) = 1.875$$
$$\hat{y}_2 = -1.5 + 1.125x_{21} = -1.5 + 1.125(4) = 3$$
$$\vdots$$
$$\hat{y}_6 = -1.5 + 1.125x_{61} = -1.5 + 1.125(2) = 0.75$$

بۆ هەژمارکردنی بەهای باقییەکان ئەم دەقەی(7.3) بەکاردەهێنین:-

$$e_i = y_i - \hat{y}_i$$
$$e_1 = y_1 - \hat{y}_1 = 2 - 1.875 = 0.125$$
$$e_2 = y_2 - \hat{y}_2 = 5 - 3 = 2$$
$$\vdots$$
$$e_6 = y_6 - \hat{y}_6 = 1 - 0.75 = 0.25$$

لەسەر ئەو بنچینەیەدا، ئەوا سەرجەمی دووجاکانی باقییەکان بەم شێوەی خوارەوەدەبێت :-

$$\sum_{i=1}^{n} e_i^2 = \sum_{i=1}^{6} e_i^2 = e_1^2 + e_2^2 + \cdots + e_6^2$$
$$= (0.125)^2 + (2)^2 + \cdots + (0.125)^2 = 7.75$$

دەتوانرێت مەزەندەی نیشانەکانی لاریبوونی هێڵی فرەیی بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :-

$$S_{y/x_1} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{n-2}} = \sqrt{\frac{7.75}{6-2}} = 1.3919$$

بۆیە مۆدێلی لاریبوونی فرەیی بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :-

$$\hat{\beta}_1 = \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}X_{i2}\right)^2}$$
$$= \frac{(18)(12) - (-8)(-8)}{(16)(12) - (-8)^2} = \frac{152}{128} = 1.1875$$

$$\hat{\beta}_2 = \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)^2}$$

$$= \frac{(-8)(16) - (18)(-8)}{(16)(12) - (-8)^2} = \frac{16}{128} = 0.125$$

$$\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1 \bar{x}_1 - \hat{\beta}_2 \bar{x}_2$$
$$= 3 - (1.1875)(4) - (0.125)(1) = -1.875$$

$$\hat{y}_i = -1.875 + 1.1875 x_{i1} + 0.125 x_{i2}$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپەیوەندیەکی راستەوانە لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆو هەردوو گۆڕاوی سەربەخۆ هەیە، چونکە بەهای هاوکۆلکەی لاربیونیان موجەبە.

هاوکۆلکەی دیاریکردن بۆ مۆدێلی هێڵی فرەیی لەنێوان(Y) لەگەڵ($X_1$) و($X_2$) ئەویش بەم شێوەی خوارەوەیە:—

$$R^2_{y\cdot x_1 x_2} = \frac{\hat{\beta}_1 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i + \hat{\beta}_2 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2}$$

$$= \frac{(1.1875)(18) + (0.125)(-8)}{28} = \frac{20.375}{28} = 0.7277$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کە(72.77٪) لەو گۆڕانەی کەلە(Y)ڕوودەدات، بۆ هەردوو گۆڕاوی ($X_1$) و ($X_2$) دەگەڕێتەوە و، ئەوەی دەشمینێتەوە(27.23٪) گۆڕاوی سەربەخۆی دیکە ڕاڤەی دەکات و لێکۆڵینەوەیان لەبارەیەوە نەکراوە.

هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی فرەیی لەنێوان(Y) لەگەڵ($X_1$ و $X_2$) بەم شێوەی خوارەوەیە:—

$$r_{y.x_1x_2} = \sqrt{R^2_{y.x_1x_2}} = \sqrt{0.7277} = 0.8531$$

ئەمەش مانای ئەوەیە، کەپەیوەندیەکی راستەوانەی بەهێز لەنێوان گۆڕاوی ناسەربەخۆ و گۆڕاوی سەربەخۆی(   ) هەیە.

سەبارەت بەهەڵەی پێوەرکاری بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :-

$$R^2_{y.x_1x_2} = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2} \Rightarrow 0.7277 = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{28} \Rightarrow 0.2723 = \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{28}$$

$$\Rightarrow \sum_{i=1}^{n} e_i^2 = (0.2723)(28) = 7.6244$$

لەسەر ئەو بنچینەیەدا دەتوانرێت هەڵەی پێوەرکاری بەم شێوەی خوارەوە بەدەست بهێنرێت :-

$$S_{y/x_1x_2} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{n-3}} = \sqrt{\frac{7.6244}{6-3}} = \sqrt{2.5415} = 1.5942$$

ئێستا دەتوانرێت خشتەی بەراوردکاری لەنێوان هەردوو مۆدێل بەم شێوەی خوارەوە دروست بکرێت:-

| پێوەر | مۆدێلی لاریبوونی هێلی سادە | مۆدێلی لاریبوونی هێلی فرەیی |
|---|---|---|
| $\hat{\beta}_0$ | 1.5- | 1.875- |
| $\hat{\beta}_1$ | 1.125 | 1.1875 |
| $\hat{\beta}_2$ | --- | 0.125 |
| هاوکۆلکەی پێکەوەلکان | 0.85 | 0.8531 |
| هاوکۆلکەی دیاریکردن | 0.7225 | 0.7277 |
| هەڵەی پێوەرکاری | 1.3919 | 1.5942 |

لـەم خشـتەیەدا سـەرنجی ئـەوەدەین، کەبـەهای نیشـانەکان جیـاوازن، ئەمـەش لەئەنجامی زیادکردنی گۆڕاوی سەربەخۆی دووەم بـۆ مۆدێلـە هێڵـی یـە سـادەکە، لەگـەڵ مانەوەی نیشانەکان وەك خۆیان، هەروەها زیادبوونێکی کەم لەهاوکۆلکەی پێکەوەلکان و دیاریکردن لەمۆدێلی هێڵی فرەیی لەسەر مۆدێلی هێڵی سادە دەبینرێـت، لەهـەمان کاتـدا هەڵەی پێوەرکاری زیادی کردووە، بەڵگەیە لەسەر نەبوونی توانستی مۆدێلی هێڵی فرەیی دا، بەبەراورد بەمۆدێلی هێڵی سادە، ئەمەش مانای ئەوەیە پشت بـەمۆدێلی هێڵـی سـادە ببەسترێت، چونکە بەهای هەڵەی پێوەرکاری باشـترەو کـەمترە، ئـەویش لەبـەر نـەبوونی گرنگی گۆڕاوی دووەم لەو مۆدێلەدا.

**تێبینی** :- شتێکی ئاساییە بەهای هەڵەی پێوەرکاری لەمۆدێلی هێڵی فرەیی نزم دەبێت، ئەگەر بێتو گۆڕاوی زیادکراوی دووەم بەمۆدێلی هێڵی سادە گرنگی گەورەی لەراڤـەکردنی گۆڕانی گۆڕاوی سەربەخۆ هـەبێت، هـەروەها دەتوانرێـت ئـەوە بزانرێـت کاتێـك سـەرنجی هاوکۆلکەی هەر یەك لەپێکەوەلکان و دیـاریکردن بدرێت(بریتییـە لـەزیادبوونی مەعنـەوی کەدەتوانرێت لەمیانەی ئەزموونە ئامارییەکان دووپات بکرێتەوە).

## ڕاهێنانی بەشی حەوتەم

1.7:– مەبەست لەهاوکۆلکەی لاریبوونی هێڵی سادە چییە؟

2.7:– باسی پەیوەندی نێوان لاریبوونی هێڵی سادەو هاوکۆلکەی لاریبوون بکە؟

3.7:– لەئەزموونێکی کشتوکاڵی دا، لێکۆڵینەوە لەکاریگەریی زیادبوونی بڕی پەینی کیمیاوی لەسەر بڕی بەرهەمی گەنم دیار بکەو ئەم ئەنجامانەی خوارەوەت هەیە:–

| بڕی پەین | 14 | 10 | 3 | 9 | 11 | 15 | 8 | 13 | 17 | 19 | 7 | 8 | 9 | 12 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بڕی بەرهەم | 9 | 7 | 2 | 5 | 8 | 11 | 6 | 8 | 13 | 15 | 4 | 5 | 6 | 7 |

**داواکاری بریتییەلە** :-

1) شێوەی بڵاوبوونەوەی داتاکان بکێشە، کەبریتییە لەبڕی پەینی کیمیاوی و بڕی بەرهەمی گەنم.

2) مەزەندەی مۆدێلی هێڵی لەنێوان بڕی پەین و بڕی بەرهەم بکە.

3) بڕی چاوەڕوانکراو چەندە، ئەگەر بێتو بڕی پەین یەکسان بێت بە(20).

4) هاوکۆلکەی دیاریکردن بدۆزەرەوەو راڤەشی بکە.

5) هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان بڕی پەین و بڕی بەرهەم بدۆزەرەوە.

**4.7** :– یەکێك لەفەرمانگەکانی کەش و هەوای هەرێمی کوردستان ئەم داتایانەی خوارەوەی لەبارەی کەش و هەوای هەشت ڕۆژی بارانـاوی هەریەك لەپلەی گەرماو بڕی باران تۆمارکردووە :–

| پلەی گەرما | 2- | 1 | 1- | 3 | 2 | 3 | 1 | 2 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بڕی باران | 5 | 4 | 6 | 7 | 5 | 4 | 3 | 2 |

**داواکاری بریتییەلە** :-

1) گۆڕاوی سەربەخۆ(X) و گۆڕاوی ناسەربەخۆ (Y) دیار بکە.

2) مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە بکە (Y/X).

3) شێوەی بڵاوبوونەوەی پلەی گەرما لەبەرامبەر بڕی باران لەگەڵ هێڵی لاریبوونی مەزەندەکراو بکێشە.

4) هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە هەژمار و راڤە بکە.

5) هاوکۆلکەی دیاریکردن هەژمار و راڤە بکە.

6) هەڵەی پێوەرکاری بۆ مۆدێلی مەزەندەکراو لەداواکاری دووەم هەژمار بکە .

7) بەهای(Y) چەندە، ئەگەر بێتو ($x= 8, 9, 10,$).

**5.7** :- ئەم داتایانەی خوارەوە بریتییە لەبڕی خواست لەکالای(Y)، داهاتی مانگانە($X_1$) ونرخی یەك دانە لەو کالایە($X_2$) بۆ بژاردەیە کە لە(12) خێزان پێك هاتووە.

| 7 | 13 | 6 | 10 | 8 | 9 | 4 | 5 | 4 | 6 | 5 | 2 | Y |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 118 | 150 | 115 | 145 | 125 | 135 | 110 | 105 | 95 | 120 | 110 | 90 | $x_1$ |
| 3 | 4 | 3 | 4 | 5 | 5 | 2 | 5 | 4 | 6 | 7 | 10 | $x_2$ |

**داواکاری بریتییەلە** :-

1)- مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی فرەیی بۆ بڕی خواست لەو کالایە و بەپشت بەستن لەسەر داهاتی مانگانەو نرخی یەك دانە بکە.

2)- مەزەندەی هاوکۆلکەی فرەیی لەنێوان(Y) و هەردوو گۆڕاوی سەربەخۆی($X_1$) و($X_2$) و راڤەشی بکە.

3)-هاوکۆلکەی دیاریکردن بۆ مۆدێلی هێڵی فرەیی مەزەندەکراو لەداواکاری یەکەم هەژمار بکە و راڤەکەشی بکە.

4)- هەڵەی پێوەرکاری بۆ مۆدێلی مەزەندەکراو لەداواکاری یەکەم هەژمار بکە.

5)- مەزەندەی بڕی خواست بکە لەو کالایە ، کاتێك($X_1=200$ و $X_2=12$).

6)- مەزەندەی لاریبوونی هێڵی سادەی بڕی خواست لەو کالایە بکە بەپشت بەستن بەداهاتی مانگانە.

7)- هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە لەنێوان بڕی خواست لەو کالایە داهاتی خێزان هەژمار بکە.

8)- هەژماری هاوکۆلکەی دیاریکردن بۆ مۆدێلی هێڵی سادەی مەزەندەکراو لەداواکاری شەشەم بکە .

9)- هەژماری هەڵەی پێوەرکاری بۆ مۆدێلی مەزەندەکراو لەداواکاری شەشەم بکە.

10)- بەراورد لەنێوان هەردوو مۆدێلی مەزەندەکراو لەداواکاری یەکەم و شەشەم بکە، ئەویش لەمیانەی هەڵەی پێوەرکاری دا.

**6.7**:- ئەگەر ئەم زانیاریانەی خوارەوەت هەبێت:-

| | | | |
|---|---|---|---|
| $\bar{Y} = 7.14$ | $\bar{X}_1 = 9$ | $\bar{X}_2 = -1.57$ | $n=7$ |
| $S_y = 6.012$ | $S_1 = 6.377$ | $S_2 = 4.541$ | |
| $r_{y1} = 0.991$ | $r_{y2} = -0.912$ | $r_{12} = -0.955$ | |

**داواکاری بریتییەلە** :-

1- مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە( $y/x_1$ .) بکە.

2- مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە بکە( $y/x_2$ .)

3- مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادە( $(x_1/x_2)$ بکە.

4- مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی سادەی( $x_2/x_1$ . ) بکە.

5- مەزەندەی مۆدێلی لاریبوونی هێڵی فرەیی( $y/x_1 x_2$ ) بکە.

6- شێوەی بڵاوبوونەوە لەگەڵ هێڵی لاریبوون بۆ مۆدێلی مەزەندەکراوی سەرەوە بکێشە .

7- هەژماری هاوکۆلکەی دیاریکردنی مۆدێلە مەزەندەکراوەکانی سەرەوە بکە.

8- هەژماری هەڵەی پێوەرکاری بۆ مۆدێلە مەزەندەکراوەکانی سەرەوە بکە.

9- بەراورد لەنێوان توانستی مۆدێلە مەزەندەکراوەکان بۆ گۆڕاوی y بکە، ئەویش لەمیانەی هاوکۆلکەی دیاریکردن و هەڵەی پێوەرکاری

10- بەشێوەی هەژمارکردن بسەلمێنە، کەسەرجەمی باقییەکانی مۆدێلە مەزەندەکراوەکانی سەرەوە یەکسانە بەسفر .

11- مەزەندەی بەهایy بکە کاتێك $x_1 = 20$

12 - مەزەندەی بەهای( y ) بکە کاتێك. $x_2 = 10$

13 - مەزەندەی بەهای( y) بکە کاتێك. $x_2 = 10$ و $x_1 = 20$ .

# سەرچاوەکان

## یەکەم :سەرچاوە عەرەبییەکان:



| زنجیرە | سەرچاوە |
|---|---|
| 1 | الراوي ، د.خاشع، (1980) ، **المدخل إلى الإحصاء** ، جامعة الموصل. |
| 2 | المشهداني ، د.محمود حسن وأمير حنا هرمز، (1989) ، **الإحصاء** ، جامعة بغداد-بيت الحكمة. |
| 3 | الناصر ، د.عبد المجيد حمزة الناصر ود.عصرية ردام المرزوك ، (1989) ، **العينات** ، جامعة بغداد-بيت الحكمة. |
| 4 | الناصر ، فوزي عبد الرزاق ، (1985)، مبادئ الإحصاء الحديث (مترجم)، الجامعة المستنصرية ، مطبعة جامعة الموصل. |
| 5 | الهيتي ، د.صلاح الدين حسين ، (2006)، **الأساليب الإحصائية في العلوم الإدارية-تطبيقات باستخدام SPSS** ، جامعة مؤتة. |
| 6 | جودة ، د.محفوظ ،(2008)، **التحليل الإحصائي الأساسي باستخدام SPSS** ، جامعة العلوم التطبيقية-مطبعة وائل . |



## دووەم :سەرچاوە بیانییەکان :



| Series | References |
|---|---|
| 7 | Agresti, A. (1990). **Categorical Data Analysis**. New York: John Wiley and Sons. |
| 8 | Ashford, J.R. (1959). **An approach to an analysis of data for semiquantal responses in biological assay**. Biometrics. |
| 9 | Azzalini,A.(1996), **Statistical Inference** Based on the Likelihood London: Chapman and Hall. |
| 10 | Barndorff-Nielsen, O.E. (1988). **Parametric Statistical Models and Likelihood**. New York: Springer, |
| 11 | Barndorff-Nielsen, O.E. and Cox, D.R. (1989). **Asymptotic Techniques for Use in Statistics**. London: Chapman and Hall. |
| 12 | Birnbaum, A. (1962). **On the foundations of statistical inference**. Journal of the American Statistical Association, 57. |
| 13 | Brookes, B.C. and Dick, W.F.L. (1951). **Introduction to Statistical Method**. London: Heinemann. |
| 14 | Christensen, R. (1990). **Log-Linear Models**. Berlin: Springer. |

| | |
|---|---|
| 15 | Collet, D. (1991). **Modelling Binary Data**. London: Chapman and Hall. |
| 16 | Cook, R.D. (1977). **Detection of influential observations in linear regression**. Techno metrics, 19. |
| 17 | Cook, R.D. and Weisberg, S. (1982). **Residuals and Influence in Regression**. London: Chapman and Hall. |
| 18 | Cox, D.R. (1972). **Regression models and life tables** (with discussion). Journal of the Royal Statistical Society B, 34. |
| 19 | Cox, D.R. (1990). **Role of models in statistical analysis**. Statistical Science, 5. |
| 20 | Cox, D.R. and Hinkley, D.V. (1974). **Theoretical Statistics**. London: Chapman and Hall. |
| 21 | Dalgaard, P. (2002). **Introductory Statistics with R**. New York: Springer. |
| 22 | Davison,A.C. (2003). **Statistical Models**. Cambridge: Cambridge University Press. |
| 23 | Dobson, A.J. (1990). **An Introduction to Generalized Linear Models**. London: Chapman and Hall. |
| 24 | Draper,N.R.and Smith, H. (1981). **Applied Regression Analysis**. 2nd ed. New York: John Wiley and Sons. |
| 25 | Faraway, J.J. (2005). **Linear Models with R**. Boca Raton, FL: Chapman and Hall/CRC. |
| 26 | Fisher,R.A.(1956).**Statistical Methods and Scientific Inference**. Edinburgh: Oliver and Boyd. |
| 27 | Fraser, D.A.S. (1979). **Inference and Linear Models**. New York: McGraw Hill. |
| 28 | Haberman, S.J. (1978). **Analysis of Qualitative Data**. Volume 1. Introductory Topics. San Diego, CA: Academic Press. |
| 29 | Knight,K.(2000). **Mathematical Statistics**. New York: Chapman and Hall. |
| 30 | Lee,E.T.(1992).**Statistical Methods for Survival Data Analysis**. New York: John Wiley and Sons. |
| 31 | Linhart, H. and Zucchini, W. (1986). **Model Selection**. New York : John Wiley and Sons. |
| 32 | Lindsey, J.K. (1995a). **Modelling Frequency and Count Data**. Oxford: Clarendon Press. |
| 33 | Lindsey, J.K. (1995b). **Introductory Statistics: The Modelling Approach**. Oxford: Oxford University Press. |
| 34 | Lindsey, J.K. (1996). **Parametric Statistical Inference**. Oxford: Clarendon Press. |
| 35 | Lindsey, J.K. (1997). **Applying Generalized Linear Models**. New York: Springer. |
| 36 | Miller, R.G. (1981). **Survival Analysis**, New York: John Wiley and Sons. |
| 37 | Searle, S.R. (1971). **Linear Models**. New York: John Wiley and Sons. |

| | |
|---|---|
| 38 | Seber, G.A.F. (1977). **Linear Regression Analysis**. New York: John Wiley and Sons. |
| 39 | Silvey, S.D. (1980). **Statistical Inference**. London: Chapman and Hall. |
| 40 | Steel,R.G.D. and Torrie, J.H. (1980). **Principles and Procedures of Statistics**. New York: McGraw Hill. |
| 41 | Stigler,S.M. (1986). **The History of Statistics**: The Measurement of Uncertainty Before 1900. Cambridge, MA: Belknap Press. |
| 42 | Stirzaker, D.R. (1994). **Elementary Probability**. Cambridge: Cambridge University Press. |
| 43 | Uusipaikka, E.I. (2006). **Statistical Inference Package SIP**. http://www.wolfram.com/products/applications/sip/. |
| 44 | Weisberg, S. (1985). **Applied Linear Regression**. 2nd ed. New York: John Wiley and Sons. |
| 45 | Welsh, A.H. (1996). **Aspects of Statistical Inference**. New York: John Wiley and Sons. |
| 46 | Wetherill, G.B. (1986). **Regression Analysis with Applications**. London: Chapman and Hall. |

# پاشكۆكان

## پاشكۆی A : زاراوە زانستییەكان

## پاشكۆی B : پوختەی دەقە ئامارییەكان

# پاشکۆی A

# زاراوە زانستییەکان

| کوردی | ئینگلیزی | عەرەبی |
|---|---|---|
| یەکتربڕ | Intercept | تقاطع |
| یەکەکانی بژاردە | Sampling Units | وحدات المعاينة |
| یەك گۆڕاو | Univariate | متغير واحد |
| ئەگەرەکان | Probability | إحتمالات |
| ئەزموونکردنی ئاماری | Statistics Tests | إختبارات إحصائية |
| ئەزموونکردنی گریمانەکان | Test of Hypothesis | إختبار الفرضيات |
| ئامراز | Tool | أداة |
| ئاماری خوێندنەوەیی | Inference Statistical | إحصاء إستدلالي |
| ئاماری بەجێهێنان | Applied Statistics | إحصاء تطبيقي |
| ئاماری باسەنی | Descriptive Statistics | إحصاء وصفي |
| ئامار | Statistics | إحصاء |
| ئامارژەکان | Indexes | مؤشرات |
| ئاستی متمانە | Confidence level | مستوى الثقة |
| ئاست | Level | مستوى |
| یاساکان | Laws | قوانين |
| وردەکاری | Accuracy | دقة |
| وەرگرتن | Accept | قبول |
| هێڵی بەیانی | Line Chart | خط بياني |
| هێڵی | Linear | خطي |
| هەڵەی ڕەمەکی | Random Error | خطأ عشوائي |

| | | |
|---|---|---|
| هەڵەی پێومرکاری | Standard Error | خطأ معياري |
| هەڵەکان | Errors | أخطاء |
| هاوکێشەکان | Equations | معادلات |
| هاوکۆلکەی لێکنزیکبوون | Coefficient of Association | معامل الإقتران |
| هاوکۆلکەی لاربیوون | Regression Coefficient | معامل الإنحدار |
| هاوکۆلکەی دیاریکردن | Coefficient of Determination | معامل التحديد |
| هاوکۆلکەی جیاوازی | Coefficient of Variation | معامل الإختلاف |
| هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی هێڵی سادە | Simple Linear Correlation Coefficient | معامل الإرتباط الخطي البسيط |
| هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی فرەیی | Multiple Correlation Coefficient | معامل الإرتباط المتعدد |
| هاوکۆلکەی پێکەوەلکانی بەشەکی | Partial Correlation Coefficient | معامل الإرتباط الجزئي |
| هاوکۆلکەی پەرشوبڵاوی | Coefficient of Dispersion | معامل التشتت |
| هاوکۆلکەی هاوکۆك | Coefficient of Contingency | معامل التوافق |
| هاوکۆلکە | Coefficient | معامل |
| هاوشێوەیی | Homogenous | تجانس |
| هاوشێوەیی | Symmetric | متماثل |
| نموونەیی | Optimum | مثالية |
| نزمترین ڕادەی توێژ | Lower Limit of a Class | حد الأدنى للفئة |
| نزمبۆوە | Decreasing | تنازلي |
| نزم | Lower | أدنى |
| نەگۆڕ، چەسپاو | Constant | ثابت |
| نەشکانەوە بەهیچ لایەك | Unbiased | غير متحيز |
| نێوەنجی ئەندازەیی | Geometric Mean | وسط هندسي |

| | | |
|---|---|---|
| نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو | Weighted Mean | وسط حسابي موزون (المرجح) |
| نێوەنجی دووجا | Quadratic Mean | وسط تربيعي |
| نێوەنجی هاوکۆکی | Harmonic Mean | وسط توافقي |
| نێوەنج | Mean | متوسط (وسط حسابي) |
| ناوەڕاست | Median | وسيط |
| نا هێڵی | Non-Linear | غير خطي |
| مۆدێل | Model | نموذج |
| موجەب | Positive | موجبة |
| متمانە | Confidence | ثقة |
| مەودای هەمووەکی | Total Range | مدى كلي |
| مەودا | Range | مدى |
| شتە زۆر دووبارەبووەکان، مەنوال | Mode | منوال |
| مەزەندەکردنی ماوە | Interval Estimation | تقدير فترة |
| مەزەندەکردنی خاڵبەندی | Point Estimation | تقدير نقطي |
| مەزەندەکردن | Estimation | تقدير |
| مەزەندەکراو | Estimator | مقدر |
| ماوە | Time | زمن |
| لێکۆڵینەوەی دانیشتوان | Demography | دراسات سكانية |
| لۆگاریتم | Logarithm | لوغارتم |
| لاربوونی هێڵی سادە | Simple Linear Regression | إنحدار خطي بسيط |
| لاربوونی هێڵی فرەیی | Multiple Linear Regression | إنحدار خطي متعدد |
| لاری | Slop | ميل |
| لادانی نێوەنج | Mean Deviation | إنحراف متوسط |

| | | |
|---|---|---|
| لادانی چارەگی | Quartile Deviation | إنحراف ربيعي |
| لادانی پێوەرکاری | Standard Deviation | إنحراف معياري |
| لادان | Deviation | إنحراف |
| کێشەکان | Weights | أوزان |
| کۆمەڵگای ئاماری | Statistical Population | مجتمع إحصائي |
| کۆمەڵگای سنووردار | Finite Population | مجتمع محدود |
| کۆمەڵگای بێ سنوور | Infinite Population | مجتمع غير محدود |
| کۆمەڵگا | Population | مجتمع |
| کۆمەڵە | Group | مجموعة |
| کردە | Process | عملية |
| کەمترین چارەگ | Lower Quartile | ربيع أدنى |
| کەرتەکان | Blocks | قطاعات |
| قۆناغەکان | Stages | مراحل |
| قەبارە | Size | حجم |
| گونجاوی مۆدێل | Goodness of Fit | حسن المطابقة (ملائمة النموذج) |
| گۆڕاوی نا سەربەخۆ | Dependent Variable | متغير تابع أو معتمد |
| گۆڕاوی سەربەخۆ | Independent Variable | متغير مستقل |
| گۆڕاوی ڕەمەکی | Random Variable | متغير عشوائي |
| گۆڕاو | Variable | متغير |
| گۆڕانەکان | Changes | تغيرات |
| گەشەکردن | Growth | نمو |
| چوارچێوەی بژاردە | Sampling Frame | إطار المعاينة |
| چەماوەی دووبارەیی کۆکراوە | Cumulative Frequency Curve | منحنى تكراري متجمع |

| | | |
|---|---|---|
| چەماوەی دووبارەیی | Frequency Curve | منحنى تكراري |
| چەماوە | Curve | منحني |
| چاوەڕوانكراو | Expectation | توقع |
| چارەگەكان | Quartiles | ربيعات |
| شێوەی بەیانی | Graphical | رسوم بيانية |
| شێوازەكان | Approaches | أساليب |
| شیكردنەوەی لاربیوون | Regression Analysis | تحليل الإنحدار |
| شیكردنەوەی داتاكان | Analysis Data | تحليل البيانات |
| شیكردنەوە | Analysis | تحليل |
| شكانەوە بەلایەكدا | Biased | تحيز |
| شایستەی پێوانەكردنە | Measurable | قابلة للقياس |
| شایستەی پێوانەكردن نییە | Un measurable | غير قابلة للقياس |
| شاز | Outlier | شاذه |
| سێ ڕوویی | 3-Dimintion | ثلاثي الأبعاد |
| سنوور | Limits | حدود |
| ڕێككەوت | Chance | صدفة |
| ستوونە لاكێشەییەكان | Bars | أعمدة مستطيلة |
| ستوونە بەیانییەكان | Bar Charts | أعمدة بيانية |
| ستوونە بەیانییە ئاوێتەییەكان | Clustered or Stacked Bar Chart | أعمدة بيانية مركبة |
| ستوونە بەیانییە سادەكان | Simple Bar Chart | أعمدة بيانية بسيطة |
| ستوون | Column | عمود |
| سەنتەری تۆێژ | Center of a Class | مركز الفئة |
| سەرجەم | Summation | مجموع |
| سەرەتایی | Prior | أولية |

| | | |
|---|---|---|
| سالیب | Negative | سالبة |
| زۆرترین چارەگ | Upper Quartile | ربيع أعلى |
| زنجیرە | Series | سلسلة |
| زانیارییەکان | Information | معلومات |
| رێگای ئاماری | Statistical Method | طريقة إحصائية |
| رێگای چوارگۆشەی بچووکی ئاسایی | Ordinary Least Squares Method | طريقة المربعات الصغرى الإعتيادية |
| رێگا نا رەمەکییەکان | Nonrandom Samples | طرائق غير عشوائية |
| رێگا رەمەکییەکان | Random Samples | طرائق عشوائية |
| ریزی ئاسۆیی | Row | صف |
| ریزبەندی و خستنەرووی داتاکان | Data Tabulation and Presentation | تبويب وعرض البيانات |
| ریزبەندی | Rank | رتبة |
| رێژە | Proportions | نسب |
| رەهادار | Absolute | مطلقة |
| رەفتار | Behavior | سلوك |
| رەگ | Root | جذر |
| رەتکردنەوە | Reject | رفض |
| راڤەکردن | Interpreting | تفسير |
| ژمارەی پێوانەیی | Index numbers | أرقام قياسية |
| ژمارەی توێژەکان | Number of Classes | عدد الفئات |
| دیاریکراو | Deterministic | محددة |
| دوولایەنە | Double | مزدوج |
| دووجا | Square | مربع |
| دووبارەی توێژ | Class Frequency | تكرار الفئة |

| | | |
|---|---|---|
| دوو گۆڕاو | Bivariate | متغيرين |
| درێژی تویژ | Length of Class | طول الفئة |
| دەق | Formula | صيغة |
| دەبێتە هۆی | Due to | تعزى إلى |
| داله | Function | دالة |
| داتاکان | Data | بيانات |
| داتا ئامارییەکان | Statistical data | بيانات إحصائية |
| داتا نا ڕیزکراوەکان | Not- tabulated Data | بيانات غير مبوبة |
| داتا ڕیزکراوەکان | Tabulated Data | بيانات مبوبة |
| داتا لکاوەکان | Continuous data | بيانات متصلة |
| داتا ڕیزبەندییەکان | Ordinal data | بيانات ترتيبية |
| داتا ژمارەییەکان | Quantitative data or Scale | بيانات كمية |
| داتا خەسلەتە جۆرییەکان | Qualitative data | بيانات صفات نوعية |
| داتا پچڕ پچڕەکان | Discrete data | بيانات متقطعة |
| داتا بەناوەکان | Nominal data | بيانات إسمية |
| دابەشکردنی سروشتی | Normal Distribution | توزيع متماثل (توزيع طبيعي) |
| دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوە | Cumulative Frequency Distribution | توزيع تكراري متجمع |
| دابەشکردنی دووبارەیی ڕێژەیی | Proportionate Frequency Distribution | توزيع تكراري نسبي |
| دابەشکردنی دووبارەیی | Frequency Distribution | توزيع تكراري |
| خشتەی دووبارەیی | Frequency Table | جدول تكراري |
| خشتەی هاوکۆك | Contingency Table | جدول توافق |
| خشتەکان | Tables | جداول |
| خستنەڕووی بەیانی | Graphical Presentation | عرض بياني |

| | | |
|---|---|---|
| خەسڵەتەکان | Properties | خصائص |
| جیاکاری هاوبەش | Covariance | تباين مشترك |
| جیاکاری | Variance | تباين |
| جووتە | Even | زوجي |
| جۆراوجۆری گۆڕاوەکان | Multivariate | متعدد المتغيرات |
| پێوانەکانی ناکۆکی ناوەندی | Measures of Central Tendency | مقاييس النزعة المركزية |
| پێوانەکانی پەرشوبڵاوی | Measures of Variation | مقاييس التشتت |
| پێوانەکان | Scales | قياسات |
| پێکەوەلکانی نێوان خەسڵەتەکان | Correlation between Attributes | إرتباط بين الصفات |
| پێکەوەلکان | Correlation | إرتباط أو تلازم |
| پێچەوانەیی | Inverse | معكوس |
| پێشبینی کردن | Prediction | تنبؤ |
| پۆلێن کردن | Classical | تصنيف |
| پلیکانی دووبارەیی | Histogram | مدرج تكراري |
| پلەی ئازادی | Degree of Freedom | درجة الحرية |
| پرسینەوە | Questionnaire | إستبانة |
| پەیوەندی | Relationship | علاقة |
| تیۆری ئاماری | Statistical Theory | نظرية إحصائية |
| تێکرا | Average | معدل |
| توێژ | Class | فئة |
| لایەنی شازەکان | Extreme | متطرفة |
| تەوەرەی ئاسۆیی | Horizontal Axis | محور أفقي |
| تەوەرەی ستوونی | Vertical Axis | محور عمودي |

| | | |
|---|---|---|
| تەواو | Exact | تامة |
| تاکی | Odd | فردي |
| تابلۆکانی کۆنترۆلی جۆری | Quality Control Charts | لوحات السيطرة النوعية |
| تا دەتوانرێت کەم بێت | Minimize | أقل مايمكن |
| بینەرەکان | Observation | مشاهدات |
| بینەرە راستەقینەکان | Real Observations | مشاهدات حقيقية |
| بڵاوبوونەوە | Scatter | إنتشار |
| بزربوو | Missing | مفقودة |
| بژاردەی مەبەستدار | Purposive Sample | عينة عمدية |
| بژاردەی قۆناغە جیاجیاکان | Multi-stage Random Sample | عينة ذات مراحل متعددة |
| بژاردەی ڕەمەکی چینەکان | Stratified Random Sample | عينة عشوائية طبقية |
| بژاردەی ڕەمەکی سادە | Simple Random Sample | عينة عشوائية بسيطة |
| بژاردەی بەشی | Quota Sample | عينة حصصية |
| بژاردەی بە ڕێککەوت | Accidental Sample | عينة بالمصادفة |
| بژاردەکردن | Sampling | معاينة |
| بژاردە | Sample | عينة |
| بەهای مەزەندەکراو | Expected Value | قيمة مقدرة |
| بەهای پێوەرکاری | Standard value | قيمة معيارية |
| بەرزترین ڕادەی توێژ | Upper Limit of a Class | حد الأعلى للفئة |
| بەرزبوەوە | Increasing | تصاعدي |
| بەرز | Upper | أعلى |
| باقیيەکان | Residuals | بواقي |

| | | |
|---|---|---|
| بازنەی بەیانی | Pie Chart | دائرة بيانية |
| چەماوەی شکانەوە | Skew ness | إلتواء |
| پلەی جوڵاوی چەماوە | Kurtosis | تفلطح (تفرطح) |
| مەودای هێزی پاڵنەر | Moment | عزوم |
| زنجیرە هێڵە ڕاستی دووبارەیی | Frequency Polygon | مضلع تكراري |
| نیشانەکان | Parameters | معالم أو معلمات |

## پاشکۆی B

## دەقی ئاماری

| ئامازەی ئاماری | دەقی ماتماتیکی |
|---|---|
| قەبارەی بژاردە لە سەر بنچینەی نێوەنج | $$n=\frac{z^2\sigma^2}{e^2}$$ |
| قەبارەی بژاردە لە سەر بنچینەی رێژە | $$n=\frac{z^2\,P(1-P)}{e^2}$$ |
| مەودای هەمووەکی | $$T.R=x_L-x_S+1$$ |
| ژمارەی توێژەکان- رێگای یول | $$m=(2.5)\sqrt[4]{n}=(2.5)n^{1/4}$$ |
| ژمارەی توێژەکان -رێگای ستزجس | $$m=1+(3.322)\log_{10}(n)$$ |
| درێژی توێژ | $$L=\frac{T.R}{m}$$ |
| سەنتەری توێژ | $$x=\frac{L.L+U.L}{2}$$ |
| دووبارەبوونە رێژەییەکان | $$f_i^*=\frac{f_i}{n}.100$$ |

| | |
|---|---|
| دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەی بەرزبۆوە | $F_1 = f_1$<br>$F_2 = f_1 + f_2$<br>$\vdots$<br>$F_m = f_1 + f_2 + \cdots + f_m$ |
| دابەشکردنی دووبارەیی بەرزبۆوەی ڕێژەیی | $F_i^* = \frac{F_i}{n}.100$ |
| دابەشکردنی دووبارەیی کۆکراوەی نزمبۆوە | $F_1' = n$<br>$F_2' = n - f_1$<br>$\vdots$<br>$F_m' = n - f_1 - f_2 - \cdots - f_{m-1} = f_m$ |
| دابەشکردنی دووبارەیی نزمبۆوەی ڕێژەیی | $F_i'^* = \frac{F_i'}{n}.100$ |
| دووبارەی تێکرا ( یەکسان نەبوونی درێژی توێژەکان ) | $f_i^* = \frac{f_i}{L_i} \quad ; \quad i = 1,2,\cdots,m$ |
| گۆشەی کەرتی بۆ بازنەی بەیانی | $\theta_i = \frac{A_i}{T} \times 360^\circ$ |
| نێوەنجی هەژمارکردن بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان | $\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{n} x_i}{n}$ |
| تێکرای کۆمەڵگا | $\mu = \frac{\sum_{i=1}^{N} x_i}{N}$ |
| نێوەنجی هەژمارکردن بۆ داتا ڕیزکراوەکان | $\bar{x} = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} f_i}$ |

| | |
|---|---|
| نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان | $\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{n} w_i x_i}{\sum_{i=1}^{n} w_i}$ |
| نێوەنجی هەژمارکردنی کێشکراو بۆ داتا ڕیزکراوەکان | $\bar{x}_w = \frac{\sum_{i=1}^{m} w_i f_i x_i}{\sum_{i=1}^{m} w_i f_i}$ |
| نێوەنجی هاوکۆکی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان | $H = \frac{n}{\sum_{i=1}^{n} \frac{1}{x_i}}$ |
| نێوەنجی هاوکۆکی بۆ داتا ڕیزکراوەکان | $H = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i}{\sum_{i=1}^{m} \frac{f_i}{x_i}}$ |
| نێوەنجی دووجایی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان | $Q = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} x_i^2}{n}}$ |
| نێوەنجی دووجایی بۆ داتا ڕیزکراوەکان | $Q = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{m} f_i x_i^2}{\sum_{i=1}^{m} f_i}}$ |
| نێوەنجی ئەندازەیی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان 1- | $G = \sqrt[n]{\prod_{i=1}^{n} x_i} = \left(\prod_{i=1}^{n} x_i\right)^{\frac{1}{n}}$ |
| نێوەنجی ئەندازەیی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان 2- | $G = anti - Log_{10}\left(\frac{1}{n}\sum_{i=1}^{n} Log_{10} x_i\right)$ |

| | |
|---|---|
| نێوەنجی ئەندازەیی بۆ داتا ڕیزکراوەکان-1 | $G = \sqrt[\sum_{i=1}^{m} f_i]{\prod_{i=1}^{m} x_i^{f_i}} = \left( \prod_{i=1}^{m} x_i^{f_i} \right)^{\frac{1}{n}}$ |
| نێوەنجی ئەندازەیی بۆ داتا ڕیزکراوەکان-2 | $G = anti - \log_{10}\left( \frac{1}{n} \sum_{i=1}^{m} f_i \log_{10} x_i \right)$ |
| ناوەڕاست بۆ داتا ڕیزکراوەکان لە میانەی دابەشکردنی دووبارەیی بەرزبۆوە | $Me = L_i + \left[ \frac{n/2 - F_i}{f_i} \right] \cdot w$ |
| ناوەڕاست بۆ داتا ڕیزکراوەکان لە میانەی دابەشکردنی دووبارەیی نزمبۆوە | $Me = L_i + \left[ \frac{F_i' - n/2}{f_i} \right] \cdot w$ |
| مەودا بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان | $R = x_l - x_s$ |
| مەودا بۆ داتا ڕیزکراوەکان | حساب الفرق مابين مركز الفئة العليا والدنيا هةذماركردني جياوازي لة نيَوان سةنتةري تويَذي بةرز و نزم دا |
| لادانی نێوەنجی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان | $M.D = \frac{\sum_{i=1}^{n} \lvert x_i - \bar{x} \rvert}{n}$ |
| لادانی نێوەنجی بۆ داتا ڕیزکراوەکان | $M.D = \frac{\sum_{i=1}^{m} f_i \lvert x_i - \bar{x} \rvert}{\sum_{i=1}^{m} f_i}$ |
| لادانی چارەگی بۆ داتا نا ڕیزکراوەکان | $Q \cdot D = \frac{Q_u - Q_l}{2}$ |

| | |
|---|---|
| لادانی پێوەرکاری بۆ داتا نا ریزکراوەکان −1 | $S=\sqrt{\dfrac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2}{n-1}}$ |
| لادانی پێوەرکاری بۆ داتا نا ریزکراوەکان −2 | $S=\sqrt{\dfrac{\sum_{i=1}^{n}x_i^2-\dfrac{\left(\sum_{i=1}^{n}x_i\right)^2}{n}}{n-1}}$ |
| لادانی پێوەرکاری بۆ داتا نا ریزکراوەکان −3 | $S=\sqrt{\dfrac{\sum_{i=1}^{n}x_i^2-n\bar{x}^2}{n-1}}$ |
| لادانی پێوەرکاری بۆ داتا ریزکراوەکان | $S=\sqrt{\dfrac{\sum_{i=1}^{m}f_i(x_i-\bar{x})^2}{\sum_{i=1}^{m}f_i-1}}$ |
| جیاکاری بۆ داتا نا ریزکراوەکان | $S^2=\dfrac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2}{n-1}$ |
| جیاکاری کۆمەڵگا | $\sigma^2=\dfrac{\sum_{i=1}^{N}(x_i-\bar{x})^2}{N-1}$ |
| جیاکاری بۆ داتا ریزکراوەکان | $S^2=\dfrac{\sum_{i=1}^{m}f_i(x_i-\bar{x})^2}{\sum_{i=1}^{m}f_i-1}$ |
| هاوکۆلکەی جیاوازی | $C\cdot V=\dfrac{S}{\bar{x}}\cdot 100$ |

| | |
|---|---|
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی هێڵی سادە | $$r_{xy}=\frac{\operatorname{cov}(x,y)}{S_x \cdot S_y}=\frac{S_{xy}}{S_x \cdot S_y}$$ |
| جیاكاری هاوبەش | $$\operatorname{cov}(x,y)=S_{xy}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{n-1}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی ڕیزبەندی بۆ سپیرمان( لە دۆخی نەبوونی دووبارە ) | $$r_{xy}=1-\frac{6\cdot\sum_{i=1}^{n}d_i^2}{n(n^2-1)}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی ڕیزبەندی بۆ سپیرمان( لە دۆخی بوونی دووبارە ) | $$r_{xy}=1-\frac{6\cdot\left(\sum_{i=1}^{n}d_i^2+k\right)}{n(n^2-1)}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی بەشەكی بۆ سێ گۆڕاو | $$r_{12.3}=\frac{r_{12}-r_{13}r_{23}}{\sqrt{(1-r_{13}^2)(1-r_{23}^2)}}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی بەشەكی بۆ چوار گۆڕاو | $$r_{12.34}=\frac{r_{12.3}-r_{14.3}r_{24.3}}{\sqrt{(1-r_{14.3}^2)(1-r_{24.3}^2)}}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی جۆراوجۆر بۆ سێ گۆڕاو −1 | $$r_{1.23}=\sqrt{\frac{r_{12}^2+r_{13}^2-2r_{12}\cdot r_{13}\cdot r_{23}}{1-r_{23}^2}}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی جۆراوجۆر بۆ سێ گۆڕاو−2 | $$r_{1.23}=\sqrt{1-(1-r_{12}^2)(1-r_{13.2}^2)}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی جۆراوجۆر بۆ چوار گۆڕاو | $$r_{1.234}=\sqrt{1-(1-r_{12}^2)(1-r_{13.2}^2)(1-r_{14.23}^2)}$$ |
| هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی جۆراوجۆر بۆ k لە گۆڕاوەكان | $$r_{1.234}=\sqrt{1-(1-r_{12}^2)(1-r_{13.2}^2)(1-r_{14.23}^2)\cdots(1-r_{1k.23\ldots k-1}^2)}$$ |

| | |
|---|---|
| $C=\sqrt{\frac{r-1}{r}}$ | هاوكۆلكەی هاوكۆك |
| $C.A_2=\frac{f_{11}\cdot f_{22}-f_{12}\cdot f_{21}}{f_{11}\cdot f_{22}+f_{12}\cdot f_{21}}$ | هاوكۆلكەی لێكنزیكبوون لە دوخی دوو ئاست |
| $C.A_G=\frac{\sum_{i=1}^{m}f'_{ij}+\sum_{j=1}^{k}f''_{ij}-T'_{.i}-T'_{j.}}{2n-\left(T'_{.i}+T'_{j.}\right)}$ | هاوكۆلكەی لێكنزیكبوون لە دوخی دوو ئاست یان زیاتر |
| $\hat{y}_i=\hat{\beta}_0+\hat{\beta}_1x_i$ | مۆدێلی لارییوونی هێلی سادە |
| $\hat{\beta}_1=\frac{S_{xy}}{S_x^2}=\frac{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})(y_i-\bar{y})}{\sum_{i=1}^{n}(x_i-\bar{x})^2}=\frac{\sum_{i=1}^{n}x_iy_i-n\bar{x}\cdot\bar{y}}{\sum_{i=1}^{n}x_i^2-n\bar{x}^2}$ | هاوكۆلكەی لارییوونی هێلی سادە |
| $\hat{\beta}_0=\bar{y}-\hat{\beta}_1\bar{x}$ | خاڵی یەكتربڕینی هێلی لارییوون لەگەڵ تەوەرەی ستوونی |
| $e_i=y_i-\hat{y}_i$ | باقییەكان |
| $\hat{\beta}_1=\frac{S_y}{S_x}\cdot r_{xy}$ | پەیوەندی نێوان هاوكۆلكەی لارییوون $\hat{\beta}_1$ و هاوكۆلكەی پێكەوەلكانی سادە |
| $R^2=\left(r_{xy}\right)^2$ | هاوكۆلكەی دیاریكردن −1 |

| | |
|---|---|
| $R^2 = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{\sum_{i=1}^{n} (y_i - \bar{y})^2}$ | هاوكۆلكەی دیاریكردن −2 |
| $R^2 = \frac{\sum_{i=1}^{n} (\hat{y}_i - \bar{y})^2}{\sum_{i=1}^{n} (y_i - \bar{y})^2}$ | هاوكۆلكەی دیاریكردن−3 |
| $S_{y/x} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{n-2}}$ | هەڵەی پێوەركاری |
| $\hat{y}_i = \hat{\beta}_0 + \hat{\beta}_1 x_{i1} + \hat{\beta}_2 x_{i2}$ | مۆدێلی لاریبوونی جۆراوجۆر كە دوو گۆڕاوی سەربەخۆی هەبێت |
| $\hat{\beta}_1 = \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)^2}$ | هاوكۆلكەی لاریبوون بۆ $x_1$ |
| $\hat{\beta}_2 = \frac{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)}{\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1}^2\right)\left(\sum_{i=1}^{n} X_{i2}^2\right) - \left(\sum_{i=1}^{n} X_{i1} X_{i2}\right)^2}$ | هاوكۆلكەی لاریبوون بۆ $x_2$ |
| $\hat{\beta}_0 = \bar{y} - \hat{\beta}_1 \bar{x}_1 - \hat{\beta}_2 \bar{x}_2$ | خاڵی یەكتربڕینی ئاستی لاریبوون لەگەڵ تەوەرەی ستوونی |
| $R^2_{y.x_1x_2} = \left(r_{y.x_1x_2}\right)^2$ | هاوكۆلكەی دیاریكردنی لاریبوونی هێڵی جۆراوجۆر( دوو گۆڕاو ) −1 |

| | |
|---|---|
| $$R^2_{y.x_1x_2} = 1 - \frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2}$$ | هاوكۆلكەی دیاریكردنی لاریبوونی هێڵی جۆراوجۆر( دوو گۆڕاو ) -2 |
| $$R^2_{y.x_1x_2} = \frac{\sum_{i=1}^{n} (\hat{y}_i - \bar{y})^2}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2}$$ | هاوكۆلكەی دیاریكردنی لاریبوونی هێڵی جۆراوجۆر( دوو گۆڕاو ) -3 |
| $$R^2_{y.x_1x_2} = \frac{\hat{\beta}_1 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i1} Y_i + \hat{\beta}_2 \cdot \sum_{i=1}^{n} X_{i2} Y_i}{\sum_{i=1}^{n} Y_i^2}$$ | هاوكۆلكەی دیاریكردنی لاریبوونی هێڵی جۆراوجۆر( دوو گۆڕاو ) -4 |
| $$S_{y/x_1x_2} = \sqrt{\frac{\sum_{i=1}^{n} e_i^2}{n-3}}$$ | هەڵەی پێوەركاری بۆ لاریبوونی جۆراوجۆر( دوو گۆڕاو ) |

